بنەماکانی پێزو ڕەوشت

# چیرۆکەکانی منداڵی زیرەك

15 چیرۆکی بەناوبانگ










وەرگێڕانی: مامۆستا دیار ئەسعەد

# چیرۆکی پیپا و براکانی

هەبوو نەبوو بەرازێکی خنجیلە و جوان و گوێڕایەڵ هەبوو ناوی پیپا بوو، پیپای بەراز لەگەڵ دایک و باوک و دوو برا و داپیرەو باپیرەی دەژیا، پیپا بەرازێکی گوێڕایەڵ بوو، هەمووکات بیری لەو شتانە دەکردەوە کە فێریان دەکرد، پیپا زوو فێر دەبوو لەبەر ئەوەی بە تامزرۆییەوە گوێی لە مامۆستا و دایک و باوکی دەگرت، پیپا ئەوشتانەی کە لە خوێندنگا پیان دەوت لە بیری خۆیدا دەیهێشتنەوەو لە یادی نەدەکردن، بەردەوام تامزرۆی ئامۆژگارییەکانی باپیرەی بوو، ڕۆژێکیان باپیرەی باسی ماڵ و شوێنی نیشتەجێبونی بۆ دەکرد، هەوڵی دەدا کە پیپا تێبگەیەنێت کە شوێنی نیشتەجێبوون چەند گرنگە، حەزی دەکرد کاتێک پیپا گەورە بوو، خانویەکی باشی هەبێت، هەتا تێدا بحەسێتەوە، ڕۆژێکیان پیپا و جۆرج و جاکی برای بڕیاریاندا هەریەکەو خانویەک بۆ خۆیان دروستبکەن و لە ماڵێکی جیادا بژین، ئەم مەسەلەیەیان لەگەڵ دایکیان باسکرد، دایکیان پێی وتن ڕەنگە ئێوە ڕاست بکەن و مافی





خۆتانە کورپنە بەڵام بیرتان بێت ئاگاتان لە گورگی خراپ بێت، بەرازە بچووکەکان ماچی دایکیان کردوو کەوتنە ڕێ، زۆری پێنەچوو ماندوو بوون و دانیشتن تاکو پشوویەک بدەن، لەو کاتەدا جوتیارێک بە وێدا تێپەڕی کە باوەشێک پووشی هەڵگرتبوو، جررجی بەرازی یەکەم کە برای گەورەبوو ووتی: من بەو پووشانە دەتوانم خانوویەکی بەهێز و سەلامەت بنیات بنێم، ئێوە بڕۆن بەبێ من، من لێرە دەمێنمەوە، بۆیە جۆرجی براگەورە ماڵئاوایی لە پیپا و براکەی کرد و باوەشە پووشەکەی لە جوتیارەکە کڕی زۆر بە تامزرۆییەوە کاری دەکرد، زۆری پێنەچوو جوانترین خانوی دروست کرد کە تا ئەو کاتە نەبینرا بوو، لەهەمان کاتدا پیپا و براکەی ڕێکەوتنیان لەگەڵ داربڕێک کرد کە باوەشێک چیلکەی هەڵگرتبوو، براکەی بە پیپای وت: من بەو چیلکانە دەتوانم خانوویەکی بەهێز و سەلامەت دروست بکەم، تۆ دەتوانی بە بێ من بڕۆیت من لێرەدا دەوەستم، برای دووەمی پیپا وای بە پیپا ووت، بۆیە براکەی پیپا ماڵئاوایی کردوو باوەشە چیلکەکەی لە داربڕەکەی کڕی و زۆر بە تامزرۆییەوە کاری کرد، زۆری پێنەچوو تا کاتی ئێوارە جوانترین خانووی دروست کرد کە تا ئەو کاتە بینرابێ، ئێستا مایەوە پیپا بەتەنها مایەوەو



زۆرتر ڕۆشت و تا گەیشت بە کرێکارێک کە گالیسکەیەکی پێ بوو پڕبوو لە خشت، پیپا بیری کەوتەوە کە لە خوێندنگا مامۆستا فێری ئەوەی کردووە کە لە دروستکردنی شوێنی نیشتەجێبوندا بەکارهێنانی خشت باشترینە بۆیە ووتی: بەم خشتانە دەتوانم خانوویەکی بەهێز و سەلامەت دروست بکەم، من لێرە دەوەستم، بۆیە لەگەڵ کرێکارەکە ڕێکەوت و خشتەکانی لێ کڕی و زۆر بە ئازایانە کاری کرد، ڕێک و پێک ترین خانووی خشتی دروست کرد کە تا ئەو کاتە بینرابێت، ئەو شەوە جۆرجی براگەورەی پیپا بە ئارامیەوە لە کوخە پوشەکەیدا خەوت بەڵام لە نیوە شەودا گوێی لە دەنگی تە پە تەپ بوو کە لە دەرگاکەدرا، یەکێک بە کروزانەوە ووتی: بەرازی بچوک، بەرازی بچوک ڕێم بدە بێمە ژوورەوە، کاتێک جۆرجی بەراز لە نێوان پووشەکانەوە سەیری کرد بینی گورگە گەورە خراپەکەیە زۆر ترسا بەڵام بە ئازایی یەوە وەڵامی دایەوە و ووتی: نا، نا، نایەڵم بێیتە ژوورەوە، گورگەکە هاواری کرد ئاخر فوو لە کوخەکەت دەکەم، گورگەکە یەک فووی توندی لە کوخەکە

کردوو هەموو پوشەکانی برد بە ئاسماندا، ماڵەکەی لە خولەکێکدا با بردی، بەڵام جۆرجی بەراز هەر چۆنێک بێت توانی خۆی ڕزگار بکات و خۆی بگەیەنێتە ماڵی براکەی، جاکی بەراز، دوای چەند شەوێکی کەم دوو جۆرج و جاکی بەراز لە ماڵە چیلکەکەدا نوستبوون لەناکاو گوێیان لە تەپەیەک بوو لە دەرگای دا، دەنگێک بە کروزانەوە ووتی: بەرازە بچوکەکان، بەرازی بچوک ڕێم بدە بێمە ژوورەوە، جۆج و جاکی بەراز لە نێوان خۆیاندا مشت و مڕیان بوو نەیان دەزانی کێ یە لە دەرگاکە دەدات بەڵام بە ئازایی یەوە وەڵامیان دایەوە ووتیان: نا، نا، نایەڵین بێیتە ژوورەوە، ماڵەکەمان بچوکە هەر جێی خۆمان دەبێتەوە، گورگەکە هاواری کرد ئاخر فوو لە ماڵەکەتان دەکەم، گورگەکە فوویەکی توندی لە خانووە چیلکەکە کرد و لە ماوەی خولەکێکدا خانووە کە با بردی، بەڵام جۆج و جاکی بەراز توانیان خۆیان ڕزگاربکەن و هەرچونێک بێت بەسەلامەتی خۆیان گەیاندە خانووە خشتەکەی پیپا لەوێ بۆ ماوەیەک هەرسێکیان بەیەکەوە مانەوە، ڕۆژێک تێپەڕی و سێ بەرازەکە پێکەوە نوستبوون، لە نیوە شەودا



تەپەیەک هات و لە دەرگاکەیدا و گوێیان لە دەنگێکی لەرزۆک بوو ووتی: بەرازە بچوکەکان، بەرازە بچووکەکان ڕێگەم پێبدەن بێمە ژووری، پیپا و جۆرج و جاکی بەراز یەکسەر زانیان کە کێیە بەڵام باوەشیان بەیەکدا کرد و بە ئازاییەوە وەڵامیان دایەوە ووتیان: نا، نا ڕێگە نادەین بێیتە ژووری، گورگەکە هاواری کرد و ووتی: ئاخر دوایی فوو لە خانووەکەتان دەکەم، گورگەکە فوویەکی توندی لە خانووەکە کرد بەڵام خانووە کە وەک خۆی مایەوە و بە فووە بەهێزەکەی گورگەکە هیچی لێ نەهات، گورگەکە زۆر تووڕە بوو ووتی: ئەگەر ڕێم نەدەن لە دەرگاکەوە بێمە ژووری ئەوا لە دوو کەڵ کێشەکەوە دێمە ژووری، بەڵام پیپای بەراز گوێی لە دەنگی پێی گورگەکە بوو لە سەربانەکە بە خێرایی مەنجەلێکی گەورەی ئاوی خستە سەر ئاگری ناو ئاگردانەکەو کاتێک گورگەکە بازی دایە خوارەوە کەوتە ناو ئاوە گەرمەکەوە و سووتا، ئەوە کۆتایی گورگە گەورە خراپەکە بوو.



# جێری مشک یارمەتی تۆمی پشیلە دەدات

هەبو نەبوو پشیلەیەک هەبوو ناوی تۆم بوو، تۆمی پشیلە لە ماڵێکدا دەژیا، تۆمی پشیلە گەورەبوو کاتێک بە ماڵەکەدا دەڕۆشت هەموو شتەکان دەلەرینەوە، ڕۆژێکیان تۆمی پشیلە وا ڕێکەوت بچێتە ژوری نان خواردنەوە لە ناکاو لەژێر قاچیەوە گوێی لە دەنگێکی نزم بوو کە زیاتر گوێی لێگرت دەنگەکە دەیـوت: تکایە وریابە تۆ بەو هەموو قورسیەوە لەسەر کلکم وەستاویت، تۆمی پشیلە بەسەرسامیەوە تەماشایەکی خوارەوەی کرد تا بزانێ ئەو دەنگە چیە، بینی لە نێوان دوو پەنجەی قاچیدا جێری مشک دیارە، مشکەکە بە تۆمی پشیلە ووت: تکایە قاچەکانت بەرز بکەرەوە با ئازاد بم، ڕۆژێک دێت پیاوەتیت دەدەمەوە، تۆمی پشیلە وەڵامی دایەوە: تکایە وا مەڵێ من هیچ کات ئازاری زیندەوەرەکانی هاوڕێم نادەم، من وەک ئەو پشیلانە نیم کە تۆیان ئازار داوە، هەر بۆیە قاچەکانی بەرز کردەوەو جێری مشک ڕایکرد و ڕزگاری بوو بۆ ماوەیەکی زۆر جێری مشکەکە نەبینرایەوە، دوای ئەوەی چەند مانگێک تێپەڕی لە دوای ئەو ڕووداوەوە تۆمی پشیلە زۆر بە ووریاییەوە قاچەکانی دەخستە سەر زەوی و تەماشای پێش خـۆی دەکـرد



نەوەکو هاوڕێیەکی ئازار بدات ڕۆژێکیان ماڵی بەجێهێشت بەرەو دارستان بەڵام تا ئەمەی کرد خۆی لەناو تۆڕێکدا بینیەوە کە لەلایەن ڕاوچیەکەوە گرتبوویان بەڵام لەو کاتەدا لە ناکاو گوێی لە چرپەیەک بوو ووتی: نیگەران مەبە پێویست بە هیچ ترسێک ناکات من ڕزگارت دەکەم، کاتێک تەماشای کرد بینی جێری مشکە کە پێش چەند مانگێک یارمەتی دا، بۆیە لە ماوەیەکی کەمدا جێری مش هەموو دەزووەکانی داوەکەی بە ددانە تیژەکانی پچڕاند و تۆمی پشیلەی ئازاد کرد و تۆمیش سوپاسی جێری مشکی کرد کرد کە ڕزگاری کردووە، لەم چیرۆکەوە دەبێ فێری ئەوە ببین کە ئەگەر یارمەتی کەسێک بدەیت ئەوا یارمەتی دەدرێیتەوە.





# بەسەر هاتی تۆم و جێری

ڕۆژێکی درێژ و گەرمی هاوین تۆمی پشیلە بە قەراغ شاردا پیاسەی دەکرد، زۆر دڵ خۆش بوو کە خۆر تووکە سوورەکەی دەدرەوشانەوە، زۆر سەرقاڵ بوو بە شانازی کردن بە خۆیەوە بە شێوەیەک کە تێبینی بیرێکی کۆنی نەکرد لە باخچەیەکی پشت گوێ خراودا، پێش ئەوەی کە بزانێت چی ڕوودەدات بازیدایە سەر لێواری بیرەکەو یەکسەر کەوتە ناو بیرەکەوە، بیرەکە ئاوی زۆر تیا نەبوو هەر بۆیە تۆمی پشیلە تەواو سەلامەت بوو لەناو بیرەکەدا بەڵام بیرەکە زۆر قوڵ بوو لێوارەکانی ناوەوەی زۆر ڕێک و ساف بوو کە نەیدەتوانی پیایدا هەڵگەڕێ، تۆمی پشیلە هەر زوو هەستی بەوە کرد کە ناتوانێ جارێکی تر باز بداتە دەرەوەی بیرەکە، دوای تێپەڕبوونی چەند کاتژمێرێک بەملاوبەولادا هەوڵی خۆ ڕزگارکردنی دەدا بەڵام بێ سوود بوو، تۆمی پشیلە لەوە ترسا کە هەرگیز جارێکی تر ڕزگاری نەبێتەوە، لەناکاو دەم و چاوێکی گێل لەسەرەوەی بیرەکەوە دەرکەوت و ووتی: سڵاو کێ لێرەیە؟ کاتێک جێری مشک لێی وورد بووەوە زانی تۆمی پشیلە بووە لە ناو بیرەکەدا هاتبوو تا بزانێت کە چی ڕوو دەدات، کۆنە ڕکابەرە سەرسەختەکەی کەوتبووە ناو بیرێکەوە، تۆمی پشیلە یەکسەر بە دوای فێڵێکدا گەڕا و ووتی: سڵاو هاوڕێ، تۆ ڕێک



له کاتی خۆیدا هاتیت، له ڕۆژێکی گەرمی وەک ئەمڕۆ دا ئایا هیچ شتێک هەیە هێندەی ئاوێکی سارد خۆش بێت؟ من دەتوانم پێت بڵێم که ئاوی ئەم بیره تەواو خۆشه، جێری مشک زۆری پێ سەیر بوو، به تۆمی پشیلەی ووت: بەڵام من چۆن بگەمە لای تۆ؟ تۆ زۆر له قوڵایی دایت، تۆمی پشیله وەڵامی دایەوەو وتی بۆچی؟ بازبده هاوڕێم، من بەڵێنت پێ دەدەم که تەواو سەلامەت دەبیت وەکو ئەوەی کەمن هاتوومەتە خوارەوە، بۆیە بزنی جێری گێلی مشک بازیدا بۆ ناو بیرەکەو بینی که ئاوەکه زۆر سارد و خۆشه بەڵام زۆری پێنەچوو جێری مشک بیری لەوە کردەوه که چۆن دەتوانن له بیرەکه بچنە دەرەوە، تۆمی پشیله ووتی، ئاسانە هاوڕێم، قاچەکانت تا دەتوانێت له بەرزیدا بێت من دەچمە سەر پشتت و بازدەدەمە سەرەوە، کەمن دەرچووم یارمەتی تۆش دەدەم ڕزگارت بێت، بەبێ بیر کردنەوە جێری مشک ئەوەی کرد که تۆمی پشیله پێی ووت: له ماوەی چەند چرکەیەکدا، تۆمی پشیله فێڵبازەکه له سەرەوەی بیرەکەوە تەماشای جێری مشکی دەکردو پێی وت هاوڕێی داماوم دەترسم ناتوانم یارمەتیت بدەم، هیوادارم کەسێک به ئێرەدا تێپەڕێ و یارمەتیت بدات، تۆمی پشیله وای ووت و بەناو دارەکاندا بازی داو ڕایکرد، وەک ئەم بیره، پەندی ئەم چیرۆکەش قوڵە بیرت بێت که تەماشا بکەیت پێش ئەوەی بازبدەیت، جێری مشک هەرچۆنێک بوو خۆی ڕزگار کرد و بەڵێنی دا هەرگیز بەگوێی خەڵکی فێڵباز نەکات.



# مشك و پشیلەكەو ئاوە گەرمەكە

هەبوو نەبوو مشكێكی بچوك هەبوو كە لەماڵێكدا دەژیا، كونێكی بچووكی ڕێك و پێكی هەبوو كە هەمیشە بە پاكی ڕایدەگرت، ماڵەكەی لە زستاندا مشكەكەی گەرم دەكردەوە، لە شەودا دەیپاراست لەو پشیلە فێڵبازەی كەلەگەڵ دایكێكدا دەژیا لە هەمان ماڵدا، بەیانیەكیان مشكەكە چوو بۆ ناو ژوری نان خواردنی ماڵەكە تا هەندێك خواردن بخوات، بەڵام نەیدەزانی كە پشیلە فێڵبازەكە بەدرێژایی ئەو ماوەیە چاودێری دەكات، كاتێك پشیلەكە بینی كە مشكەكە بەرەو كونەكەی خۆی دەگەڕێتەوە بە خێرایی بەرەو ماڵی مشكەكە ڕۆشت، بینی كە مشكەكە بیری چووە دەرگاكە دابخات، لە چاو تروكانێكدا پشیلەكە خۆی لە پشت دەرگای ماڵی مشكەكە شاردەوە، مشكەكە كە گەڕایەوە بۆ ماڵەوەو لە دەرگاكە چووە ژوورەوە پشیلەكە لە پشت دەرگاكە بازێكی داو ویستی پەلاماری مشكەكە بدات بەڵام مشكەكە ڕایكرد و لە سەر یەكێك لە مێزەكانی بنمیچی سەقفی خانوەكەی وەستا، مشكەكە پێی



وابوو كه شوێنه‌كه‌ی به‌رزه‌و پشیله‌كه ده‌ستی پێی ناگات و له‌وێ سه‌لامه‌ت ده‌بێ، پشیله فێڵبازه‌كه زه‌رده‌خه‌نه‌یه‌كی كرد ووتی: تۆ ناتوانی له ده‌ست من ڕابكه‌یت به ئاسانی، هه‌ر بۆیه پشیله‌كه زۆر به سه‌یری جوڵه‌ی ده‌كرد، مشكه‌كه له‌به‌ر خۆیه‌وه ده‌یوت: ئه‌وه چی ده‌كات؟ پشیله‌كه به دوای كلكی خۆیدا ده‌سوڕایه‌وه مشكه‌كه‌ش له‌سه‌ره‌وه ته‌ماشای ده‌كرد تا ئه‌و كاته‌ی سه‌ری سوڕاو كه‌وته خواره‌وه، به دڵنیاییه‌وه پلانه‌كه‌ی پشیله فێڵبازه‌كه سه‌ری گرت، مشكه‌كه‌ی هه‌ڵگرت و خستیه ناو توره‌كه‌یه‌كه‌وه كه‌له‌گه‌ڵ خۆیدا هێنابووی، له خه‌یاڵیدا وای دانابوو كه وه‌كو دیاریه‌ک ده‌یباته‌وه بۆ دایكی ئه‌و ژنه‌ی خاوه‌نی پشیله‌كه بوو، وه دواتر ده‌یكات به ژه‌مێكی خۆش بۆ خۆی و ده‌یخوات، بۆیه توره‌كه‌كه‌ی هه‌ڵگرت و به‌ره‌و لای ژنه‌كه به‌ڕێكه‌وت، مشكه‌كه زۆر بێده‌نگ بوو بیری ده‌كرده‌وه كه چۆن هه‌لێكی بۆ بڕه‌خسێت تا بتوانێ ڕابكات و ڕزگاری بێت، ژنی ماڵه‌كه له‌ده‌ره‌وه بوو له شت كڕین، پشیله‌كه هێنده چاوه‌ڕێی كرد هه‌رنه‌هاته‌وه بۆیه هه‌ستی به ماندوویی كردو

خەوی دەهات ویستی پشویەک بدات، بۆیە ڕاکشا تاکو سەر خەوێک بشکێنێ بە ڵام کاتێک مشکەکە گوێی لە پرخە پرخی پشیلەکە بوو، بە دەمی کونێکی کردە تورەکەکەو توانی خۆی ڕزگاربکات لە شوێنی خۆی چوو کۆمەڵێک بەردی کۆکردەوە و خستیە ناو تورەکەکەوە و بە هێواشی دوورکەوتەوە و بەرەو لای ماڵەکەی خۆی گەڕایەوە، کاتێک پشیلەکە لە خەو هەستا یەکسەر کەوتە ڕێ بۆ لای ژنی ماڵەکەو لەبەر خۆیەوە دەیوت، مشکەکە زۆر زۆر قورستر بووە هیوادارم کە دایکم هەواڵێکی خۆش بێت بەلایەوە، کاتێک پشیلەکە گەیشتە لای ژنەکەی ساحێبی دایکی زۆر دڵ خۆش بوو ووتی: پشیلە ژیرو زیرەکم یەکسەر بیخەرە ناو ئاوە کوڵاوەکەوەو بیخۆ، پشیلەکە دایکی چوونە لێواری پەنجەرەکەو توورەکە پڕ بەردەکەیان بە تاڵ کردە ناو مەنجەڵەکەوە بە خێراییەکی زۆر بەردەکان کەوتنە ناو ئاوە کوڵاوەکەوە و ئاوە کوڵاوەکە هەمووی ڕژا بەسەر دەمو چاوی پشیلەکەو دایکی و دەمو چاویان بە ئاوە کوڵاوەکە سوتاو بە هاوارکردنەوە ڕایان کردە دەرەوە و هەرگیز بۆ جارێکی تر نەبینرانەوە نەیان وێرا هەوڵی گرتنی مشکەکە بدەنەوە، مشکەکەش بە خۆشی ژیانی بردە سەرو لە دوای ئەوەی کە بەسەری دا هات هەمیشە دەرگای ماڵەکەی لەدوای خۆی دادەخست کە دەچووە دەرەوەو هیچ کاتێک بیری نەدەچوو.



# بەزمەکانی تۆم و جێری و دۆگی سەگ

تۆم و جێری واتا مشک و پشیلە، ئەوان دوو هاورێی یەک بوون کە بەردەوام کێشەیان هەبوو بەیەکەوە، تۆمی پشیلە بەردەوام هەوڵی دەدا سوکایەتی بە جێری مشک بکات، خواردنەکانی جێری مشکی دەخواردو ئازاری دەدا، ئەم دووهاورێیە بەردەوام بەیەکەوە بون و بەردەوامیش بەیەکەوە کێشەیان هەبوو، جێری مشک ڕۆژێکیان بڕیاری دا کە ئیتر ئەو ماڵە بەجێبهێڵێت کە تۆمی پشیلەی تێدا دەژیا، بۆیە ڕووی لە لادێیەکی دەورو بەری شار کرد، جێری مشک لە لادێکی زۆر دڵی خۆش بوو خواردنی زۆری لێبوو، جەنجاڵی کەمبوو، هاتوچۆی هاوڵاتیان زۆر کەمبوو، دەنگە دەنگ و ژاوە ژاو هەرنەبوو، جێری مشک لە لادێیەکی دەورو بەری شار دەژیا، تۆمی پشیلە نامەی بۆ جێری مشک نارد کە سەردانی بکات، لەنامەکەدا بۆی نوسیبوو کە زۆر بیری کردووە، ساحێبی خانووەکەیان دۆگی سەگی هێناوەتەوە بۆ





ماڵەوە هەراسانی کردووە پێویستی بە بیرۆکەکانی جێری مشکە بۆ ئاقڵ کردنی دۆگی سەگ، شار پاش چەند رۆژێک جێریی مشک.. گوندەکەیان بەجێ هێشت و چوو بۆ لای هاورێ دێرینەکەی تۆمی پشیلە، شار جێی سەرسوڕمان بوو زیاتر لەوەی پێشبینی کردبوو .. شەقامەکان لێرە قەرەباڵخە بە ئوتومبیلو خەڵکی زۆر .. پێویست بو و بازدات لەملا بۆ ئەولا نەوەک کەسێک پێی پیانێت .. یان ئوتومبیلێک دایشێلێت .. لەکاتێکدا خۆی لە قاچێکی گەورە دەپاراست نەوەک پێی پیانێت .. وئوتومبیلێکی خێرا وەختەبوو دایشێلێت .. لەناکاو خۆی بینی کەوتە زێرابی شارەوە .. دەستی بەهاوارکرد فریامکەون ... فریامکەون .. پاش مەترسیەکی زۆر کە رووبەرووی ئەم تۆمی پشیلەیە بویەوە لەم جیهانە نوێ یەدا .. جێریی مشک بیری دەکردەوە کەی شار ئەوەندە ناخۆش بوو کاتێک ئەو بەجێی هێشت، نەیزانیبوو لەماوەیەکی کەمدا دانیشتوانی شار ئەوەندە زۆر بوو بوون .. دەرئەنجام توانی بگاتە ماڵی هاورێکەی تۆمی پشیلە .. کاتێک دای لەدەرگای ماڵی هاورێکەی .. شەو داهاتبوو .. تۆمی پشیلە بەخێرهاتنی کرد و ووتی وەرە ژورەوە .. کاتێک چونە ژوری نانخواردن بۆ خواردنی نانی ئێوارە جێریی مشک سەرسام بوو لە هەموو شتێک .. هەر لە دیوارەکان هەتا رەفەکانو دۆلابەکانو خواردنی خۆشی هەمە جۆر



.. تۆمی پشیه بۆی ئامادەکردبوو، جێریی مشک هەر بەگومانەوە هەڵسوکەوتی دەکرد لەبەر ئەوەی هیچ بڕوای بە تۆمی پشیله نەمابوو، جێریی مشک سەیری کونی ماڵەکەی خۆی کرد کە کرابۆوە ئامادەکرابوو بۆی هەتا بچێتەوە ماڵەکەی خۆی ئیتر لەوێ بژی تۆمی پشیله بڕیاری دابوو هەرگیز خراپەی بەمبەر نەکاتەوە، جێریی مشک به تۆمی پشیلەی ووت: هەموو شتێک لێرە مایەی سەرسوڕمانە هاوڕێ .. جێریی مشک داوای لە .. هاوڕێکەی کرد پشووبدات .. بە تەواوی ئازادی بخواو بخواتەوە .. جێریی مشک بەدرێژایی کات سەری لە هەموو شتێک سوڕمابوو .. بەردەوام سەرسوڕمانی خۆی دەردەبڕی بە خواردنەکان .. بەڵام هەر لەسەر شێوازی لادێ نانی دەخوارد کە لای هاوڕێکەی دواکەوتوانەبوو .. کاتێک جێریی مشک ویستی هەندێک پابەندبێت بەو ڕێساو یاسایانەی هاوڕێکەی ئامۆژگاری کردبوو قاپێکی شووشە لە دەستی کەوتە خوار سەرزەوی .. شکاو دەنگێگی دروستکرد لە ئەنجامی ئەو دەنگە دەرگای ژورەکە بەتوندی کرایەوە .. خاوەن ماڵ هاتە ژورەوە .. سەگێکی گەورەی لەگەڵا بوو دەوەڕی و بۆنی ناو ژورەکەی دەکرد.. دەنگێکی تورەهات ووتی: کێ لێرە نانی خواردوە ؟!.. لەچەند چرکەیەکدا تۆم و جێری



له قوژبنەکاناد خۆیان حەشاردا .. بەڵام جێریی مشک هەناسە بڕکێی بوو عارەقەی لێدەتکاو زۆر ترسابوو .. لەترسدا دەلەرزی .. لەبەر ئەوەی یەکەم جاربوو .. تووشی مەترسیەکی لەم جۆرە بێت .. لەکاتێکدا تۆمی  پشیلە زۆر لەسەرخۆ بوو .. لەبەر ئەوەی راهاتبوو لەسەر هەموو ئەو رووداوانە .. جێریی مشک  بە تۆمی پشیلەی وت: ئەمە چییە ڕوودەدات بۆچی ناوێریت لەماڵەوە وەک جاران بە ئاسودەیی بژیت؟ تۆمی پشیلە بە جێریی مشکی ووت: هاوڕێم ئەوە حاڵی منە بۆیە تۆم بانگ کردووە هەتا هاوکاریم بکەیت بەچاوی خۆت دەیبینیت هاوڕێکەت لە چ مەینەتییەکدایە؟ ڕۆژی دواتر .. کاتێک هەردوویان جێری مشک و تۆمی پشیلە نانی نیوەڕۆیان دەخوارد.. لەناکاو تارماییەکی ڕەش دەرکەوت هەر کە جێری مشک بینی بازی داو ووتی : ئای خوا !.. ئەوە دۆگی سەگە ..؟ باڕاکەین .. هەردووکیان لە گۆشەکانی چێشتخانەکەدا .. خۆیان حەشاردا .. بەڵام دۆگی سەگ بە توڕەییەوە هاوارایکرد: ئەی تۆم و جێری فێڵباز: دووبارە هەڵهاتن بەڵام زوو یا درەنگ دەتانگرم .. بەدەستو ددانەکانم پارچە پارچەتان دەکەم .. دەمووچاوی




تۆمی پشیلە زەردهەڵگەڕابوو لە ترسداو پرسیاری لە هاوڕێکەی کرد: هاوڕێ لێرە هەمیشە ئەمە ژیانمانە ؟!.. ئەمیش بەئاسایی وڵامی دایەوە: بەڵێ .. وایە .. بەڵام ئێمە بەمە ڕاهاتوین .. خۆت بەوە سەرقاڵ مەکە هاوڕێ .. سەیرکە.. ئەوەتا دۆگی سەگە توڕەکە لەسەر خۆ ڕۆیشت .. ڕۆژی دواتر جێری مشک پێشنیاریکرد بگوێزنەوە بۆ ماڵێکی دیکە .. کە خواردن لەوێ زۆرترو باشترو خۆشتربێت .. بەڵام تۆمی پشیلە خێرا وڵامی دایەوە: نا .. نا هاوڕێ .. سوپاست دەکەم .. ئێمە لێرە ئاسودەییو ئارامیو ئاسایشمان زیاترە .. لەکاتێکدا ئێمە لێرە هەمیشە لە مەترسیدان .. بە ئومێدی دیدار هاوڕێو بوارم بدە بگەڕێمەوە بۆ گوندەکەی خۆم .. جێری مشک بیری کردەوە وتی: تۆمی هاوڕێم بیرۆکەیەکی باشم هەیە بۆ وەستاندنی دۆگی سەگ! تۆی پشیلە لەخۆشیدا هاواری کرد با دەست بکەین بەجێبەجێکردنی پلانەکەمان، تۆم و جێری شەو کاتێک دۆگی سەگ خەوی لێکەوت بەهێمنی چونوو قاچیان بە پەتێکی بەهێز بەستەوە بە دیوارەکانی کولانەکەیەوە. بۆبەیانی تۆمی پشیلەو جێری مشک چون بۆ کولانەکەی دۆگی سەگ و بانگیان کردە دەرەوە کاتێک دۆگ بە توڕەییەوە بەرەو ڕویان ڕۆشت و وتی: ئەوە ئێوە



چۆن دەوێرن بێنە بەردەمی من لەکاتێکدا ڕۆژانی تر خۆتان لێدەشاردمەوە؟ تۆم و جێری وەڵامیان دایەوەو وتیان: لەبەر ئەوشتەی بە قاچەکانتەوە بەستراوە، دۆگ کاتێک بینی قاچەکانی توند بەستراونەتەوە زۆر نا ئومێدبو، بۆیە بەناچاری چووەوە ناو کولانەکەی و بەبێدەنگی دانیش. تۆم و جێریش ڕۆژێکی خۆشیان بەسەر برد بەدڵی خۆیان نانیان خوارد. تۆمی پشیلە لە جێری مشکی پرسی: ئەوە تۆ چۆنت توانی ئەو بیرۆکە باشانەت لەکوێ بوو؟ جێری مشک بە لەخۆ باییانەوە وتی: بەڵێ ژیری بە گەورەیی بچوکی نییە ئەوەتا تۆ دە ئەوەندەی من گەورەتریت کەچی ناتوانیت وەک من بیرۆکەی زانایانە دابنێت. تۆمی پشیلە کە گوێی لەم قسانەی جێری مشک بوو یەکسەر پەلاماری جێری دایەوەو کەوتنەوە ڕاکە ڕاک و پلان گێڕی لە دژی یەک وەک پیشەی هەمیشەییان کە نەیان توانیوە هەتا سەر بەیەکەوە هاوڕێبن.



# بەسەرهاتی شازادە بامبی

وەرزی زستان بوو، دارستانەکە پڕ بوو لە هەواڵێکی خۆش، هەمووان سەرسام بوون، بیستوتە کە چی رووی داوە لە ناو کۆمەڵە دارەکە، وەرە بیبینە، باڵندەیەک وای ووت ئەو کاتەی بەسەر کوندەپەپویەکدا فڕی کە خەریک بوو سەرخەوێکی دەشکاند، هەستە کوندەپەپوی هاوڕێم شازادە گەنجەکە لە دایک بووە پێویستە خێراکەی تا بینینیت، هەر بۆیە کوندەپەپوەکە دەست بە جێ فڕی بۆ ناو کۆمەڵە دارەکە تا بە چاوی خۆی شازادە گەنجەکە ببینێت، کە گەیشتە ئەوێ زۆر دڵخۆش بوو و ووتی: لە کۆتایدا ئەمڕۆ زۆر جیاوازە لە رۆژەکانی تر شازادە لە دایک بوو. هەموو گیانلەبەرەکانی دارستانەکە کۆ بوونەوە چوون بۆ بینینی بێچوە ئاسکەکە لەوێ ئاسکێکی جوانی تازە لە دایکبوویان بینی بە لە خۆبایییەوە لە تەنیشت دایکی راکشا بوو،دایکی بە ئەسپایی چرپاندی بەگوێیدا و ووتی: هەستە میوانەکانت هاتوون، بێچووە ئاسکەکە بە ئەسپایی چاوەکانی کردەوە هەستایە سەرپێ و هێشتا بەتەواوی نەیدەتوانی لەسەر قاچەکانی بوەستی قاچەکانی دەلەرزین سەیرێکی دەورووبەری کرد پڕ بوون لە



گیانلەبەری جیاواز کە کەسیانی نەدەناسی. لەناو هەموو ئەو گانلەبەرانەی کە هاتبوون بۆ بینینی بێچووە ئاسکەکە بەچکە کەروێشکێکی بچوکی رووخۆشی تیدا بوو ناوی ترۆمپەر بوو، چووە لای دایکەکە و لێی پرسی، بێچووە ئاسکەکە ناو دەنێی چی؟ دایکەکەشی وەڵامی دایەوە و ووتی: پێم باشە ناوی بنێم بامبی، دواتر گیانلەبەرەکان بێچوە ئاسکەکەیان بەجێهێشت تا بحەوێتەوەو سەرخەوێک بشکێنێ. بەتێپەڕبوونی کات وەرزی بەهار هات شازادە بامبی تەواو گەورە بوو تا بتوانی لەسەر قاچەکانی خۆی بوەستێ و لەگەڵ دایکیدا پیاسەیەک بە ناو دارستانەکەیا بکات، بەیانیەکیان دایکی پێی ووت: وەرە لەگەڵم بامبی ئێستا کاتی ئەوەیە شوێنە جیاوازەکانی دارستانەکە ببینی و شارەزایان بیت، دوای ئەوەی بەدوای دایکدا رۆشت گوێی لە دەنگێک بوو کە سڵاوی لێکرد و ووتی: سڵاو شازادەی گەنج، دوای ئەوەی سەری هەڵبڕی و تەماشای کرد بینی خێزانی کە خۆیان بە کلکیاندا هەڵواسیوە سەری سوڕما و شپرزە بوو بە بینینیان، دوای رۆشتن بۆ ماوەیەکی کەم ترۆمپەری بینی کە لەگەڵ خێزانەکەیدا خەریکی خواردنی وێنجە (گیایەکی گەڵا وردە) بوون، بابڕۆین تۆزێک کاتی خۆش بەسەر بەرین، ترۆمپەر پێشنیاری ئەوەی بۆ بامبی کرد، بامبی زۆری پێی خۆش بوو و



رازی بوو لەگەڵیا بڕوات و بە خێرایی بەدوایدا ڕۆیشت، ئەو دوو هاوڕێیە ڕۆشتن تا گەیشتنە چەند باڵندەیەک کە بەسەر لقی دارێکەوە نیشت بوونەوە بامبی سەیری دەکردن ترۆمپەر بووی روون کردەووە کە ئەوانە باڵندەن و ترۆمپەر ویستی بامبی فێر بکات بڵێت باڵندە، بامبی هەناسەیەکی قوڵی هەڵمژی و ووتی: باڵندە، هەر کە بامبی قسەی کرد ترۆمپەر زۆر دڵخۆش بوو کە شازادە قسەی کرد دواتر پەپولەیەک لەسەر کلکی بامبی نیشتەوە بامبی زۆر بە شانازییەوە وەک ئەوەی ناوی بزانێت ووتی: باڵندە!، ترۆمپەر قاقایەکی کرد و ووتی ئەوە، باڵندە نیە ئەوە پەپولەیە، بامبی سەری لێ تێکچوو، دواتر خۆی چەماندەوە بۆ زەوی و سەیری گوڵی بچوکی ڕەنگاو ڕەنگی کرد و ووتی: پەپولە، ترۆمپەر زۆر پێکەنی و ووتی: نا بامبی ئەوانە گوڵن، زۆر جوانن، دوای ئەوەی بامبی لە تەماشاکردنی گوڵەکان تەواو بوو دەنگی ئاژەڵێکی رەنگ ڕەش و سپی هات بامبی ووتی ئەوانە گوڵی جوانن، ترۆمپەر خەریک بوو لە پێکەنینا دەقرتا بە بامبی ووت ئەوانە بودەڵەی شەرمنن. ئاساییە دەتوانی بە گوڵ بانگم بکەیت ئەگەر ویستت من پێم ناخۆش نیە، بودەڵەکە وەڵامی دایەوە، بامبی بە



هاوکاری ترۆمپەر خەریک بوو بەرە بەرە فێری ناوەکان ببێت و گیانلەبەرکانی دارستانەکە بناسێت. پاش ماوەیەک دایکی بامبی برد بۆ ناو مێرگێک دایکی زۆر بە وریایەوە دەجوڵایەوە و بۆنی هەوای دەکرد بە بامبی ووت دەبێ زۆر وریا بیت لێرە تۆ پارێزراو نیت هیچ دارێکی لێ نیە تا خۆت لە پەنایدا بشاریتەوە، دوای ئەوەی دایکی دڵنیا بوو لەوەی شوێنەکە ئارام و سەلامەتە بامبی بەجێ هێشت تاکو تۆزێک لە ناو مێرگەکەدا بمێنێتەوە، لەناو مێرگەکە بامبی بێچوە ئاسکێکی مێیەی بینی کەلە تەمەنی خۆیدا بوو ناوی فیلین بوو دواتر بامبی و فیلین بوون بە دوو هاوڕێی خۆشەویستی یەکتر. ڕۆژێکی سەرەتایی پایز بوو لەو کاتەی بامبی و هاوڕێکانی لە ناو مێرگەکەدا یارییان دەکرد ئاسکێکی بەهێز بە خێراییەکی زۆر بە ناو دارەکاندا ڕایدەکرد هەمووانی ئاگادارکردەوە لە بوونی مەترسی و داوای لێکردن دارستانەکە بە جێ بهێڵن، بامبی گوێی لە دەنگی تەقە بوو، یەکسەر بامبی و دایکی بە پەلە ڕایانکرد تاکو سەلامەت بن و خۆیان لە ناو دارەکاندا شاردەوە بامبی زۆر ترسا، دوای ئەوەی بارودۆخەکە هێمن بووەوە بامبی سەری هەڵبڕی و لە دایکی پرسی، دایکە من هیچ تێناگەم، بۆچی



ڕامانکرد؟، دایکی هێشتا بە ترسەوە سەیری ڕێگای مێرگەکەی دەکرد و بە بامبی ووت: ئەوە مرۆڤە لە دارستانەکەیا، دیار بوو ڕاوچییەکان هاتبوون بۆ ڕاوکردنی ئاسکەکان. بەیانیەکی زۆر ساردی پایز بامبی لە خەو هەستا و لە دایکی پرسی: دایکە ئەو هەموو شتە سپییە چیە؟ دایکی وەڵامی دایەوە و ووتی: بۆچی؟ ئەوە وەرزی زستان هاتووە بۆ دارستانەکەمان، بامبی بۆ یەکەمجار قاچی لەناو کۆمەڵە دارەکە خستە سەر بەفرە نەرم و سپییەکە و سەرسام بوو، شازادەی بچوک بە بەفرەکە زۆر دڵخۆش بوو و بەفرەکە بوو بە یاری بۆی، پێی سەیر بوو کە شوێن پێی لە ناو بەفرەکەدا بەجێ دەمان لەو نزیکانە گوێی لە دەنگێک بوو بانگی کرد و ووتی: هێی بامبی وەرە بۆ ئێرە ببینە کە چۆن ئاوەکە بەستویەتی، کە ئاوڕی دایەوە بینی ترۆمپەرە بانگی دەکا بەڵام هەرکە بامبی قاچی خستە سەر ئاوە بەستوەکە قاچەکانی تێک ئاڵاو یەکسەر کەوت، ترۆمپەر زۆر پێکەنی و ووتی: دەبێ زۆر بە ووریاییەوە قاچەکانت لەسەر ئاوە بەستوەکە دابنێیت، بامبی چاوە گەورەکانی کردەوە و بە ووریاییەوە هەستایە سەرپێ و خۆی بۆ لای ترۆمپەر خلیسکاند، زۆر خۆشە بامبی، ئەو دوو هاوڕێیە کاتێکی خۆشیان بە خلیسکانی سەر بەفر بردە سەر. مانگەکانی زستان بە هێواشی تێدەپەڕین خواردن



له دارستانه‌كه‌یا به‌ره به‌ره كه‌م ده‌بووه‌وه، بۆیه دایكی ناچار بوو لقی داره‌كان لێبكاته‌وه تاكو بیخۆن. دایكه زستان زۆر درێژه، بامبی له دایكی پرسی، وا ده‌رده‌كه‌وێت به‌ڵام به‌م زووانه به‌هار دێته‌وه، له كۆتایدا به‌فره‌كه توایه‌وه و وه‌رزی به‌هار گه‌ڕایه‌و بۆ دارستانه‌كه و كونده‌په‌پوكه له خه‌وه‌كه‌ی هه‌ستا و بامبی بینی و پێی ووت: ئه‌وه تۆیت شازاده گه‌نجه‌كه زۆر گه‌وره‌بویت، جووته شاخێكی جوانت بۆ درووست بووه، كونده‌په‌پوه‌كه ته‌نیا كه‌س نه‌بوو كه دڵی به شاخه‌كانی بامبی خۆش بێت فیلینی هاوڕێی منداڵیشی زۆر دڵی پێی خۆش بوو ئه‌ویش گه‌وره ببوو، ببو به ئاسكێكی شۆخ و شه‌نگ و روو خۆش به‌ره‌و بامبی رۆشت و لوتیان له‌یه‌ك خشاند وه‌كو ئاماژه‌یه‌ك بۆ سڵاو كردن، بامبی و فیلین كه‌وتبونه داوی خۆشه‌ویستی یه‌كه‌وه‌وه و پێكه‌وه له ژێر تریفه‌ی مانگه شه‌ودا پیاسه‌یان ده‌كرد. مانگه‌كانی ساڵ تێپه‌ڕی و جارێكی تر مرۆڤه‌كان گه‌ڕانه‌وه بۆ دارستانه‌كه‌و تفه‌نگ و ئاگریان له‌گه‌ڵ خۆیاندا هێنا بوو بۆیه بامبی فیلین ی به‌جێ هێشت و چووه سه‌ر به‌رزی كه‌نده‌ڵانێك و سه‌یری خواره‌وه‌ی ده‌كرد بینی ئاگریان كردۆته‌وه له‌و كاته كه سه‌یری ده‌كرد بینی پریشكی ئاگر پوش و په‌ڵاشی دارستانه‌كه كه‌وت و دارستانه‌كه گڕی گرت و به خێراییه‌كی زۆر ئاگره‌كه په‌ره‌ی سه‌ند،



بامبی بە خێراییەکی زۆر بەرەو لای فیلین و گیانلەبەرەکانی تر رایکرد بۆ ئەوەی ئاگاداریان بکاتەوە، بە خێرای هەموویان لەدارستانەکە ڕایانکرد، بامبی و فیلین لەگەڵ گیانلەبەرەکان بە درێژایی ڕووبارەکان ڕایانکرد و بە دڵتەنگیەوە سەیری دارستانەکەیان دەکرد کە دەسوتا. بەڵام جارێکی تر بەهار گەڕایەو بۆ دارستانەکەو گژوگیا سەوزەکان پاشماوەی سوتاوی دارستانەکەیان داپۆشی جارێکی تر ژیان گەڕایەوە بۆ دارستانە سوتاوەکە، ئەمجارە کوندە پەپوی هاوڕێی بامبی هەواڵی لە دارستانەکەدا بڵاو کردەوە، خێراکەن هەمووتان وەرن بۆ ناو دارەکان، هەموو گیانلەبەرەکان پەلەیان کرد تا ببینن و بزانن کە چی ڕوویداوەن لەوێ بینیان کە فیلین بە هێمنی پاڵکەوتووە و دوو بێچووەئاسکی بووە، چاوە گەورەکانی کوندە پەپوەکە لە سەرسامیدا کرایەوە و ووتی: سەیرکەن بێچوەکان دوانەن! دوانەیەک کە پێشتر نەمبینیون و دڵنیام بامبی پاشا زۆر خۆشحاڵ دەبیت، کەروێشک و سمۆرە و راکۆنەکان بە شەیداییەوە تەماشایان دەکرد. یەکێک لە بێچوەکان لەسەر قاچە بچووکەکانی وەستا و چووە سەر تەختی کەندەلانێکی زۆر گەورە لە وشوێنەی بامبی باوکی لێی وەستا بوو، کە ئێستا پاشای دارستانە، ڕۆژێک دێت ئەم شازادە گەنجە وەکو باوکی دەبێت بە پاشای دارستانەکە.



# بەسەرهاتی پشیلەی ناو پوتەکە

هەبوو نەبوو ئاشەوانێک هەبوو، ئەو ئاشەوانە سێ کوڕی هەبوو کە زۆری خۆش دەویستن بەڵام پیاوێکی دەوڵەمەند نەبوو، کاتێک ئاشەوانەکە کۆچی دوایی کرد ئاشەکەی بۆ کوڕە گەورەکەی بە جێ هێشت، بۆ کوڕە ناوەنجی یەکەشی کەرەکەی و بۆ کوڕە بچوکەکەشی پشیلەیەکی بە جێ هێشت کە تەنها مشکی ناو ئاشەکەی دەگرت، کوڕە بچوکەکەی ئاشەوانەکە بە پشیلەکەی ووت: دەزانم تۆ مشک گرێکی باشیت بەڵام نازانم کە چۆن یارمەتیم دەدەیت تاکو بژیم؟ نیگەران مەبە گەورەم، تەنها جوتێک پۆتین و توورەکەیەکم بدەرێ ،دەبینی کە زۆر باش پێی دەژین، پشیلەکە وای بە کوڕە بچووکەکە ووت و، کوڕەکەش سەری سوڕما بەڵام ئەوەی کرد کە پشیلەکە پێی



ووت، پشیلەی زیرەک هەندێک گەڵای کاهووی لە توورەکەیەک لە ناو کێڵگەکە بە جێ هێشت، کاتێک کەروێشکێکی بچووک هات تاکو کاهووەکە بخوات، پشیلەکە بازی دا لەو شوێنەی کە خۆی حەشاردابوو بە توورەکەکە کەروێشکەکەی گرت و خستیە توورەکەکەوە و دواتر بردی بۆ کۆشکی پاشا، خزمەتکارەکانی کۆشک سەرسام بوون کە پشیلەیەکیان بینی پووتی لە پێ کردووە هەر بۆیە ڕێیان دا بچێت و پاشا ببینێت، لەلای پاشا پشیلەکە ووتی: خاوەن شکۆ من خزمەتکاری بە وەفای تۆم، وە هیوا خوازم کە ئەم دیاریەم لێ قبوڵ بکەیت کە کەروێشکێکی باش و قەڵەوە، پاشا شێوازی پێشکەشە کردنی دیاری پشیلەکەی زۆر بە دڵ بوو هەر بۆیە پرسی: گەورەت کێیە؟ پشیلەکەش بە گەورەییەوە ووتی: کارا باسی خانەدان، دوای ئەوەی کە زۆر جار سەردانی پاشای دەکرد، ڕۆژێکیان بەوەی زانی کە پاشا بە نیازە لەگەڵ



شازادەی کچیدا بە درێژایی ڕووبارەکە پیاسەیەک دەکەن هەر بۆیە پشیلەکە چووەوە بۆ لای کوڕە بچوکەکەو ووتی: گەورەم، ئەمڕۆ پێویستە بچیت بۆ مەلەکردن بۆ ڕووبارەکە و خۆت وا نیشان بدە کە ناوێکی نوێت هەیە لە ئێستاوە ناوت کارا باسی خانەدانە، دواتر هەمان ڕۆژ پاشاو کچەکەی لە قەراغ ڕووبارەکە بە سواری ئەسپ و عارەبانەیەک پیاسەیان دەکرد و بەو شوێنەدا تێپەڕین کە کوڕەکە مەلەی لێدەکرد، کاتێک پشیلەکە پاشای بینی بە شپرزەییەوە بەرەو لای پاشا ڕایکرد و هاواری کرد، خاوەن شکۆ شتێکی خراپ ڕوویداوە، گەورەکەم کارا باسی خانەدان لە ڕووبارەکە مەلە دەکات و هەندێک دز هاتن و جل و بەرگەکەیان دزی؟، لە ڕاستیدا پشیلەکە خۆی جلەکانی کوڕەکەی لە ناو گژوگیا کەدا شاردبووەوە، یەکسەر پاشا خزمەتکارەکەی نارد تاکو باشترین جل و بەرگ بۆ کوڕەکە بهێنێت کاتێک کوڕەکە جلەکانی لەبەر کرد، پاشا کوڕەکەی بانگهێشت کرد تاکو سواری گالیسکەکەی پاشا بێت و ئاشنای



شازادە بێت، لەهەمان کاتدا پشیلەکەش لە پێش گالیسکەکەوە ڕایدەکرد و کاتێک کە هەندێک کەسی بینی لە کێڵگەیەکدا خەریکی کۆکردنەوەی کا بوون، پشیلەکە پێی ووتن: کاتێک پاشا بە ئێرەدا تێپەڕی بڵێن ئەم کێڵگەیە هی کارا باسی خانەدانە ،ئەگەر وانەڵێیت ئەوا پارچە پارچە دەکرێیت و دەخورێیت!، کرێکارەکان زۆر ترسان ئەوەیان ووت ئەوەیان ووت کە پیلەکە پێیان ووتبوون، هەموو ئەو کێڵگانەی کە پاشا پێیدا تێپەڕی وا دەردەکەوت هی کاراباسی خانەدان بێت، پاشا بە کوڕە بچووکەکەی ئاشەوانەکەی ووت: پیرۆزبایت لێدەکەم بۆ ئەو زەوییە باشانەی کە هەتە، خانەدانم، کوڕەکە نەیدەزانی چی ڕوودەدات و پاشا باسی چی دەکات بەڵام خۆی تێک نەدا و لە جیاتی ئەوە بە ڕووی شازادەدا پێدەکەنی، هەر لە بەردەوامی ڕێگاکە، پشیلەکە گەیشت بە قەڵایەکی گەورە، پشیلەکە بە قەڵاکەدا سەرکەوت بۆ لای خاوەنی قەڵاکەو پێی ووت: من بیستومە کە تۆ دەتوانی سیحر بکەیت، من پێم



خۆشە سیحرێکت ببینم، پیاوەکە لە چرکەیەکدا خۆی کرد بە شێر، پشیلەکە زۆر ترسا بەڵام خۆی وا نیشان دا کە نەترساوە، پشیلەکە بە پیاوەکەی ووت: ئەوە زۆر باشە بەڵام پێشبینی دەکەم کە زۆر ئەستەم بێت تاکو خۆت بکەیت بە شتێکی بچوک وەکو مشک، پیاوەکە لە چاو تروکانێکدا خۆی کرد بە مشک بەڵام پشیلەکە یەکسەر پەلاماری داو خواردی، کاتێک پاشا گەیشت بە قەڵاکە هەموو شتێک ئامادە بوو، پشیلەکە بەرەو پیری پاشا ڕۆیشت و و ووتی: بە خێر بێیت بۆ ماڵی گەورەکەم خاوەن شکۆ، بە دڵنیاییەوە پاشا زۆری بە دڵ بوو هەروەها شازادەش زۆری پێنەچوو شازادەو کوڕی ئاشەوانەکە هاوسەرگیریان کرد و بە ئاسوودەیی ژیانیان دەبردە سەر، سەبارەت بە پشیلەکەش ژێر زەمینی قەڵاکە پڕپڕ بوو لە مشک، پشیلەکەش بە ئاسوودەیی لەگەڵیاندا ژیا.

# بەسەرهاتی کەشتیەکەی نوح

زۆر لە پێش پیاوێکی زۆر باش هەبوو ناوی نوح بوو، هەمیشە هەوڵی ئەوەی دەدا کاری باش بکات، تەنانەت ئەگەر هاوڕێیەکانیشی گاڵتەیان پێبکردایە، ڕۆژێکیان خوای گەورە بە نوحی ووت: هەموو شوێنێک پڕ بووە لە خەڵکی خراپ، ئەم خەڵکە خراپانە جیهان تێک دەدەن، وە بەو شێوەیە ناژێت کە پێویستە، تەنها تۆو خانەوادەکەت پەیڕەوی یاساکانی من دەکەن لەسەر زەوی، نوح من بە نیازم کە جیهان لەو هەموو خراپەکاریانە بشۆمەوە، بەڵام تۆ دەپارێزم، بۆیە داوات لێدەکەم کە کەشتیەکی زۆر زەبەلاح دروست بکەیت، خانەوادەکەت و جووتێک لە هەموو ئاژەڵەکانی سەر زەوی تێبکەیت، نوح سەری سوڕماو بیری کردەوە، ئێمە چەندین میل لە دەریاوە دووڕین، هەرگیز لە ژیانمدا بەلەمم دروست نەکردووە، بەڵام خوای گەورە زانیاری بە نوح دا کە چۆن کەشتی دروست بکات و پیاوە باشەکەش دەستی کرد بە دروست کردنی کەشتیەکە، خەڵکی کەبەلای نوح دا تێدەپەڕین توانجیان لێدەداو پێیان ووت: ئێرە بە جێ دەهێڵی، ئەم بەلەمەی کە دروستی دەکەیت زۆر بڕ ناکات!، بەڵام نوح گوێی لە توانج و قسەی خەڵکەکە نەگرت و بەردەوام بوو



لەسەر کارەکانی، ڕۆژێک لەو کاتەی کە نوح سەرقاڵی کارکردن بوو پیاوێک بەلای دا تێپەڕی و پێی ووت: ئۆە،تۆ لەناو کەشتیکەشدا ژووریش دروست دەکەیت؟ گەشت بە دەوری جیهان دەکەیت وایە؟ بەڵام نوح زۆر بە هێمنی وەڵامی دایەوە و پێ ی ووت: دەتوانیت لەگەڵمان بێیت ئەگەر ئارەزووت لێی بوو، بەڵام پیاوەکە بە نوح پێکەنی و گەڕایەوە ماڵەوە، کاتێک کەشتیەکە تواو بوو نوح بانگی کوڕەکانی و هاوسەرەکانی کرد و داوای لێکردن کە یارمەتی بدەن لە کۆکردنەوەی جوتێک لە هەموو جۆرەکانی ئاژەڵ بەڵام بچوکترین کوڕی بە نوحی ووت: هەموو جۆرەکان؟ نوحیش وەڵامی دایەوە ووتی: بەڵێ لە هەموو جۆرەکان وە پێویستە ئاگاداری ئەوەبن کە ئاژەڵەکان یەکتری نەخۆن، هەر بۆیە ئاژەڵەکان دوو دوو خرانە ناو کەشتییەکەوە ،فیلەکان خەریک بوو کەشتیەکە بشکێنن،مەیمونەکانیش بەردەوام ڕایان دەکرد بەڵام لە کۆتاییدا دوای





ماندووبونێکی ئێجگار زۆر هەموو ئاژەڵەکان بە سەلامەتی خرانە ناو کەشتیەکەوە ،دواتر نوح و هاوسەرەکانی ومناڵەکانی و هەموو ئەو کەسانەی کە باش بوون شوێنی خۆیان گرت لە کەشتیە کەدا و خواش دەرگای کەشتیەکەی داخست،خەڵکان لە دوورو نزیکەوە بە خەڵک پێدەکەنین و گاڵتەیان پێدەکرد و پێیان ووت: دڵنیایت کە هیچت بیر نەچووە؟ ئەی کوا تۆزێک ئاو تا سەری بکەون؟ هەر لەو کاتەدا هەورێکی ڕەشی باراناوی ئاسمانی داپۆشی و بارانێکی بەتاو دەستی پێکرد بەردەوام بوو ڕۆژ لەدوای ڕۆژ هەر بەردەوام دەباری تاوای لێهات کەشتیەکە سەر ئاو کەوت،بارانەکە چل شەوو ڕۆژ باری کەشتیەکەی نوح سواری شەپۆلی لافاوەکە ببوو، لافاوەکە هێندە زۆر بوو کە هەموو خانوو و گردەکانی داپۆشی تا چاو بڕی دەکرد ئاو داپیۆشی بوو، نەهەنگی گەورەو ماسی بچوک لەگەڵ کەشتیەکەدا مەلەیان دەکرد، دوای چل ڕۆژەکە باران بارین وەستا، نوح ووتی: زۆری پێناچێ لافاوەکە کۆتایی پێدێت، بۆیە پێویستە شوێنێکی ووشک بدۆزینەوە، هاوسەرەکەی پێی وابوو کە هەتا زووتر بێت باشترە، بۆ ئەو مەبەستەش نوح یەکێک لە قەلە ڕەشەکانی نارد تاکو بڕوات و بە دوای وشکانیدا بگەڕێ بەڵام قەلە ڕەشەکە گەڕایەوەو وشکانی نەدۆزییەوە ،هەفتەیەک دواتر نوح داوای لە کۆترێک کرد تا بچێت بە دوای وشکانیدا بگەڕێت بەڵام کۆترەکەش وشکانی نەدۆزییەوە هەفتەیەکی تریش تێپەڕی جارێکی تر نوح کۆترەکەی ناردەوە بەڵام ئەم

جارەیان کۆترەکە گەڕایەوەو لقێکی دار زەیتوونی لەگەڵ خۆیدا هێنا بووەوە ونوح هاواری کرد، ئاستی ئاوەکە وا خەریکە زیاتر دادەبەزێ، دوای تێپەڕبوونی هەفتەیەکی تر نوح بۆ جاری سێیەم کۆترەکەی ناردەوە بە شوێن وشکانیدا بگەڕێ بەڵام ئەم جارەیان کۆترەکە نەگەڕایەوە، کۆترەکە شوێنێکی دۆزیەوە تاکو هێلانەی تیا دروست بکات، بۆ ڕۆژی دواتر کەشتیەکە لەسەر لوتکەی شاخێک نیشتەوە، زۆر بە خۆشیەوە نوح و خانەوادەکەی لە کەشتیەکە دابەزین و ئاژەڵەکانیش دوای کەوتن،ئاژەڵەکان ژمارەیان زیادی کرد بوو بەبەراورد بە سەرەتا، نوح دەستەکانی بەرز کردەوە بەرەو ئاسمان و سوپاسی خوای کرد کە ژیانیانی پاراست، خواش بە نوحی ووت: تۆ زۆر باش بوویت نوح، من بە ڵێن دەدەم ک هەرگیز جارێکی تر ئەو جیهانە تێک نەدەم کە خۆم دروستم کردووە، خوا پەلکە زێڕینەکەی دروست کرد بە شێوەی کەوانەیی لە زەویەوە بەرەو ئاسمان بۆ ئەوەی بە ڵێنەکەی خۆیمان وەبیر بهێنێتەوە.





# بەسەرهاتی ئەندرۆكلس و شێرەكە

زۆر لە پێش كوڕێكی گەنج هەبوو، ئەو كوڕە گەنجە كەسێكی ئازاد نەبوو، كۆیلەی بازرگانێكی ڕۆمانی بوو كەلە ئەفریقا دەژیا، ئەو بازرگانە زۆر بە خراپی مامەڵەی لەكەڵ ئەندرۆكلس دا دەكرد، ئەندرۆكلس ناچار كرابوو كە ڕۆژ بووەوە كار بكات تاكو شەو دادێت، زۆر كەم خواردنی دەدا بەو كۆیلەیەی و زۆر جار زۆر بە خراپی لێیدەدا، بەیانیەكیان كاتێك بینی كە خاوەنەكەی دێت تاكو لێیبدات، ئەندرۆكلس چیتر نەیدەتوانی بەرگەی لێدانەكانی خاوەنەكەی بگرێت بۆیە بڕیاری دا لە دەستی ڕابكات، ئەندرۆكلس ماڵەكەی بە جێ هێشت و بەرەو دەرەوەی شار ڕایكرد و لە نیوەڕۆدا، ئەندرۆكلس زۆر هەستی بە ماندوویی كرد، گەرمای بە تینی ئەفریقاش هێندەی تر بێ هێزی كرد بوو، بە دوای شوێنێكدا دەگەڕا تاكو خۆی لێبشارێتەوە و تۆزێك لێی بحەسێتەوە تا ئەو كاتەی ئەشكەوتێكی دۆزیەوە، ئەندرۆكلس بە بێ هێزیەوە بەرەو ناو ئەشكەوتەكە كەوتە ڕێ، لە ماوەی چەند خولەكێكدا حەوایەوە لەناكاو گوێی لە نەڕەیەك بوو لە





ناو ئەشکەوتەکەوە دەهات و شێوەیەکی گەورە لە تارمایی ئەشکەوتەکەوە بەرەو ڕووی دەهات، نەیدەزانی چیە تا تەواو نزیک بووەوە بۆی دەرکەوت کە شێرێکە، ئەندرۆکلس زۆر دەترسا بەڵام نەیدەتوانی لە دەستی ڕابکات هەر بۆیە چاوەکانی داخست لەبەردەم شێرەکەدا دەستەو وەستان مایەوە بەڵام شێرەکە پەلاماری نەدا، ئەندرۆکلس چاوەکانی کردەوە بینی شێرەکە دەستێکی لەسەر زەویەکەو دەستێکی تریشی بەرزکردبووەوە، ئەندرۆکلس تەماشایەکی دەستی شێرەکەی کرد بینی کە دڕکێکی گەورە چووە بە دەستیا و شوێنی برینەکە ئاوسا بوو و ئازاری هەبوو، ئەندرۆکلس یش نەیدەویست کە گیاندارەکان ئازاریان پێبگات هەر بۆیە بە وریاییەوە دڕکەکەی لەدەستی شێرەکە دەرهێنا، شێرەکە دەستی خستە سەر زەویەکەو ئازارەکەی کەمتر بووەوە.بۆ ماوەی چەند ڕۆژێک ئەندرۆکلس خۆی لەناو ئەشکەوتەکەدا شاردبووەوە بەڵام جارو بار دەچووە دەرەوە تاکو خواردن پەیدا بکات بەڵام لە یەکێک گەشتەکانیدا لەلایەن یەکێک لە پیاوەکانی بازرگانەکەوە بینراو دەستگیرکرا، پیاوەکانی بازرگانەکە ئەندرۆکلسیان بردو لە ژێر زەمینێکدا زیندانیان کرد، ئەندرۆکلس دەیزانی کە چی چاوەڕێی دەکات ئەویش ئەوە





بوو کە لە گۆڕەپانی شەڕدا لەگەڵ یەکێک لە ئاژەڵە دڕندەکان شەڕ بکات بەبەر چاوی هەزاران کەسەوە، ئەو بەیانیەی کە ئەبوو شەڕبکرێت، دوو سەرباز ئەندرۆکلسیان گرت و بەرەو گۆڕپانی شەڕەکە هێنایان، لەسەرەوەی گۆڕەپانەکە ئەندرۆکلس چەند ڕیزێک لە پەرژینی دەبینی، لەولاوە گوێی لە دەنگی نەڕەیەک بوو ئەندرۆکلس لەسەر ئەژنۆکانی کەوت و چاوەڕێی ئەو کاتەی دەکرد کە ئەو ئاژەڵە پەلاماری بدات و بیخوات. چەند خولەکێک دواتر ئەندرۆکلس هەستی بە زمانێکی زبر کرد کە بە ڕووخساریدا دەهات کە تەماشای کرد بینی ئەو شێرە بوو کەلە ئەشکەوتەکەدا یارمەتی دابوو، شێرەکە لە جیاتی ئەوەی پەلاماری بدات سەری لە گیانی ئەندرۆکلس دەخشاند وەکو ئەوەی کە پشیلەیەکی ماڵی دەیکات. خەڵکەکە ئەو دیمەنە نائاساییەیان زۆر پێ خۆشتر بوو وەک لەوەی کە شێرەکە کۆیلەکە بخوات بۆیە هەموویان چەپڵەیان لێدا و کەیف خۆش بوون تەنانەت دەسەڵاتدارانی ڕۆمیش زۆر دیمەنەکەیان بەلاوە سەیر بوو بۆیە بڕیاریان دا ئەندرۆکلس ئازاد بکەن و لە کۆیلایەتی ڕزگاری بێت ,بۆیە ئەندرۆکلسی کۆیلە خەڵات کرا بەوەی کە بە سەلامەتی و بە ئازادی لە گۆڕەپانی شەڕەکە بڕواتە دەرەوە.



# بەسەرهاتی گۆڵدی و سێ وورچەکە

هەبوو نەبوو کچێکی زۆر بزێو هەبوو ناوی گۆڵدی بوو، ڕۆژێکیان کاتێک دایکی خەریکی جل شۆرین بوو بانگی کرد تاکو یارمەتی بدات، بەڵام گۆڵدی خۆی وا نیشان دەدا کە گوێی لێ نەبووە و ڕۆیشت بەرەو دارستانەکە بۆ ئەوەی پیاسەیەک بکات لە جیاتی ئەوەی کە یارمەتی دایکی بدات، ئەمە تەنها جارێک نەبوو کە گۆڵدی یارمەتی دانی دایکی پشتگوێ بخات بەڵکو زۆر جار دەیکرد، ئەو ڕۆژە لە کاتی چوونی بۆ دارستانەکە ڕێگایەکی تازەی هەڵبژارد بەردەوام بوو لە ڕۆیشتن تاکو خۆی لە نزیک کوخێکدا دۆزییەوە، دەرگای کوخەکە تۆزێک کرا بووەوە و گۆڵدی بزێویش نەیتوانی چاوەڕێ بکات و دەرگای کوخەکەی کردەوەو چووە ژوورەوە، کوخەکە زۆر سەرنج ڕاکێش و جوان بوو لە ناوەوە و هەر چەند دەرەوەی کوخەکەش زۆر جوان بوو، گۆڵدی چووە ناو چێشتخانەکەو زۆر خۆش حاڵ بوو کە بینی سێ دەفری خڕی کەشک لەسەر مێزەکە دانرابوو، لە هەمان کاتدا هەستی بە تۆزێک برسێتی دەکرد دوای ئەوەی کە بۆ ماوەیەک ڕێی کردبوو، گۆڵدی کەوچکێکی گەورەی لە دەفرە گەورەکەدا نوقم کردوو کەشکەکەی تام کرد (ئۆو) ووتی: ئەمە زۆر گەرمە! دواتر



کەوچکێکی کرد بە دەفرە ناوەڕاستینەکە و ووتی: ئەمە زۆر ساردە، لە کۆتایدا دەفرە زۆر بچووکەکەی تاقی کردەوە و هیچی نەوت چونکە زۆر سەرقاڵ بوو بە خواردنەوە کەشکی ئەم دەفرە کە زۆر باش بوو تاکو بیخوات، کاتێک تەواو بوو لە خواردن، تێر بە سکی کەشکی خوارد بە دوای شوێنێکدا گەڕا تا تیایدا دابنیشێت و پشوویەک بدات، چووە ژووری دانیشتن سێ کورسی تیادا بوو، گۆڵدی لەسەر کورسیە گەورەکە دانیشت بەڵام یەکسەر هەڵسا لەسەر کورسیەکە ووتی: ئەم کورسیە زۆر ڕەقە، بۆڵە بۆڵی کرد و چوو لەسەر کورسیە ناوەڕاستینەکە دانیشت بەڵام ئەم کورسیەشی بە دڵ نەبوو ووتی: ئەم کورسیە زۆر نەرمە، دواجار گۆڵدی لەسەر کورسیە بچووکەکە دانیشت و ئەم کورسیەی زۆر بە دڵ بوو بەڵام هەر کە گۆڵدی لەسەر کورسیەکە دانیشت کورسیەکە جیرە جیرێ کرد و کورسیەکە شکا و بوو بە چەند پارچەیەک چونکە گۆڵدی زۆر قورس بوو، لە ئەنجامی ئەو کەوتنەوە گۆڵدی لە چەند شوێنی جەستەیەوە هەستی بە ئازار دەکرد، دوای ئەوەی گۆڵدی هەستایەوەو هەستی بە ئازار دەکرد ووتی: پێویستم بە پشووە، بۆیە بە پلیکانە کاندا چووە نهۆمی سەرەوەی کوخەکە و بینی ژوورێکی گەورەی نوستنی لێ بوو، لەو ژوورەدا سێ



شوێنی نوستنی لێ بوو، هەر دانەیەکیان لێفەیەکی گەرمی لەسەر دانرا بوو، گۆڵدی خۆی هەڵدایە سەر شوێنی نوستنە گەورە کەیان و لەسەری بازی دەداو خۆی بەرز دەکردەوەو ووتی: ئەم جێیە بەرزم ناکاتەوە و زۆر ڕەقە تاکو لەسەری باز بدەم و لەسەری بنووم، دواتر جێ نوستنە ناوەڕاستینەکەی تاقی کردەوە و لە ناوەڕاستیدا نوقم بوو چوونکە زۆر نەرم بوو، بەڵام گۆڵدی زۆر پێی ئاسوودە نەبوو و ووتی: زۆر نەرمەو من تیای نوقم دەبم و هەگیز نابینرێم، لە کۆتایدا گۆڵدی بچووکەکەیانی تاقی کردەوەو ئەوەیانی زۆر بە دڵ بوو، پێش ئەوەی بیر لەهیچ شتێک بکاتەوە زۆر بەخێرایی خەوی لێکەوت، لە ڕاستیدا سێ وورچ لەو کوخەدا دەژیان بەڵام بۆ پیاسەیەکی کورت کوخەکەیان بەجێ هێشتبوو پێش نان خواردنی بەیانی، لەو کاتەی کە گۆڵدی لەنهۆمی سەرەوە نوستبوو، سێ وورچەکە گەڕانەوە بۆ کوخەکەو چوونە ناو چێشت خانەکەو یەکسەر بینیان کە شتێکی هەڵە ڕوویداوە، کێ کەشکەکەی منی خواردووە؟ وورچی باوک بە دەنگێکی بەرز پرسیاری کرد، کێ کەشکەکەی منی خواردووە؟ وورچی دایک بە دەنگێکی نەرم پرسیاری کرد، ئەی کێ کەشکەکەی منی خواردووە؟ وورچی بچوک بە دەنگێکی زیکنەوە پرسیاری کرد، هەموویان خواردووە، بە



نیگەرانیەوە هەر سێ ورچەکە چوون بۆ ژووری دانیشتن و ورچی باوک نەڕاندی ووتی: کێ لەسەر کورسیەکەی من دانیشتووە؟ کەسێک لەسەر کورسی من دانیشتووە؟ ورچی دایک هاواری کرد، کەسێک لەسەر کورسیەکەی من دانیشتووە و شکاندوویەتی! ورچی بچووک بە گریانەوە وای ووت، ورچی باوک بە توونڈو تیژیەوە ووتی: دوام بکەون و بە پلیکانەکاندا بەرەو نهۆمی سەرەوە سەرکەوت کە چوونە ژووری نوستنەکە ورچی باوک ووتی: هەروەکو ئەوەی کە بیرم لێ ئەکردەوە کەسێک لەسەر شوێنی نووستنەکەم بازی داوە، کەسێک لەسەر شوێنی نوستنەکەی منیش وایکردووە، ورچی دایک لەلای خۆیەوە وای ووت، ورچی بچووکیش بە دەم گریانەوە ووتی: کەسێک لەسەر جێی نوستنەکەی من نوستووە هێشتا لە وێیە سەیری بکەن! لەو کاتەدا گۆڵدی لە خەو هەڵساو سێ دەم و چاوی تووڕەی بینی کە تەماشایان دەکرد، گۆڵدی کە ئەمەی بینی لە جێگاکە ڕاپەڕی و لە ژوورەکە ڕایکردە دەرەوە و بەرەو دارستانەکە هەڵهات، بە دڵنیاییەوە جارێکی تر گۆڵدی نزیکی ماڵی ورچەکان نابێتەوە، لە دارستانەکەیا هەندێک کەس پێیان وابوو دەبێت بە کچێکی باش دوای ئەو ڕووداوەی کە بەسەری هات بەڵام من زۆر دڵنیام لەوە تۆش وایت؟



# بەسەرهاتی گۆریلا گەورە خراپەکە

دەتوانی لەهەر شوێنێکی دارستان بتانەوێت دەتوانن یاری بکەن، دایکیان وای بە هەردوو منالّە دووانەکەی ووت، بەلاّم ئاگاداری کردنەوە کە هەر چیەک دەکەن نابێت گۆریلا گەورە خراپەکە بێزار بکەن، هەر بۆیە لیلی و جاکی برای  چوون بۆ ناو دارستانەکە و لە سەرەتادا ئەوان تەنیا تۆزێک دەترسان هەر بۆیە بە هێمنی بە نێوان دارەکاندا دەڕۆیشتن، لەبەر خۆیانەوە قسەیان دەکرد و دەیان ووت: ئایا ئەو بۆلّە بۆلّ و دەنگە دەنگەی لەم نزیکانەوە دێت هی گۆریلا گەورە خراپەکەیە؟ جاک چرپاندی بە گوێی خوشکەکەیدا و ووتی: گۆریلا گەورە خراپەکە دەبێت چۆن بێت؟ لیلی بە هێواشی وەلاّمی دایەوە و ووتی: گۆریلاکە گەورەیە، خراپە، وە ئەوە جۆرێکە لە مەیموون وا هەست ئەکەم لەوێ دەیبینم! ڕاکە! بەلاّم دوای ئەوەی تەواو بوون لە ڕاکردن لیلی وای بیر دەکردەوە کە ڕەنگە تەنیا گژو گیای بینی بێت لە شێوەی



گۆریلادا. لێلی و جاک هەردووکیان وەستان و گوێیان گرت و لە خۆیان پرسی: تۆ بڵێی ئەوە دەنگی گۆریلا بوو کە گوێیان لێ بوو؟ لیلی پرسی: تۆ بڵێی گۆریلا گەورە خراپەکە چی بخوات؟ جاک وەڵامی دایەوە و ووتی: (ئۆه ..، توو، گوێز، مێروو، لێلی ووتی: وا هەست دەکەم کە گوێم لێیە بەرەو ئێرە دێت، ڕاک! پاش ئەوەی بۆ ماوەیک ڕایان کرد و وەستان وا هەستیان کرد کە ئەوە دەنگی لقەکانی درەختەکان بوو کاتێک با لێی دەدات و هاژەی دێت، خوشک و براکە ویستیان یاری بکەن بەڵام نەیان دەتوانی چونکە هەر بیریان لای گۆریلا بوو، جاک پرسیاری لە لیلی کرد: تۆ بڵێی شێوەی گۆریلا چۆن بێت؟ وای دەووت و بە شپرزەییەوە سەیری دەوروبەری دەکرد، ئەو زۆر زۆر زۆر بەرزە .... وە دانی زۆر زۆر زۆر گەورەیە وە چنگی زۆر زۆر زۆر درێژە وا هەست ئەکەم کە ئەیبینم بەرەو ئێرە دێت لە پشت دارە کەوەیە، ڕاکە! بەڵام دوای ئەوەی کە ماندوو بوون لە ڕاکردن وەستان وا بیریان کردەوە ڕەنگە تەنیا هێلانەی باڵندەیەک بێت لەسەر لقەکانی دارەکە، لیلی و جاک بیریان لە یاری بشارەوەو بگەڕێ کردەوە تاکو بیکەن بەڵام ئەم یاریە بە مانای ئەوە دێت کە بە تەنیا بیت،






بیریان له ووتنی گۆرانی کردەوە بەڵام دەبێ کێ گوێی لێ بێت، ئەو یاریەشیان نەکرد، بیریان لەوە کردەوە گەڵای دارەکان کۆ بکەنەوە بەڵام بیریان کردەوە ئەگەر گەڵای زۆر کۆبکەنەوە و لەسەر یەکی کەڵەکە بکەن ئەوا ڕەنگە شتێک لە پشتیەوە خۆی حەشار بدات و نەتوانن ببیبنن، لە ناکاو، لیلی گوێی گرت باڵندەکان ئاوازیان نەدەخوێند، گەڵاکان نەدەلەرانەوە، هیچ دەنگێک لە هیچ لایەکەوە نەدەهات، لیلی ووتی: من ئەم بێ دەنگیەشم بە دڵ نیە وا هەست دەکەم کە کەسێک دەبینم لەو ڕێگایەوە بەرەو ئێرە دێت، ڕاکە! جاک و لیلی ڕایان کرد تاکو هەناسەیان لێ بڕا، وە لە ترسان نەیان دەزانی بەرەو کوێ ڕاکەن لە شپرزەیدا کەوتن بەسەر شتێکدا لە ژێر دارەکە بوو، لیلی لە نێوان دەستەکانیەوە تەماشای دە کرد و هاواری کرد: (ئاه هـ هـ) بەتەنز لە تەنیشت ڕەگی دارەکەوە تەماشای دەکرد و هاواری کرد: (ئاه هـ هـ)



گۆریلا گەورە خراپەکە سەیری هەردووکیانی کرد و هاواری کرد (ئاهـ هـ هـ) دواتر هەموویان بەسەر سامی یەوە سەیری یەکیان کرد، لیلی ووتی: تۆ زۆر گەورە نیت و وە زۆر خراپیش دیار نیت، گۆریلا گەورەکە ووتی: من وا نیم ئەوە تەنیا ناوەکەمە کە وایە، لیلی ووتی: کەواتە ناوێکی زۆر گەمژانەیان لێ ناویت ناو دەبێت هاو شێوەی گۆریلا بێت کە لێی دەنێیت، گۆریلا گەورە خراپەکە زەردەخەنەیەکی کرد و ووتی: ڕاست دەکەیت، با یاری بکەین بەڵام پێش ئەوە پێتان نەوتم ناوتان چیە؟ لێلی لە گۆریلاکەی پرسی ئایا تۆ چ جۆرە خواردنێک زۆر دەخۆیت؟ گۆریلاکە وەڵامی دایەوەو وتی: من زۆر حەز بە خواردنی مۆز دەکەم، جاک و لێی وتیان ئێمە مۆزی زۆرمان هەیە لەماڵەوە و بۆ نایەی تەوە بچینەوە بۆ ماڵی ئێمە؟ گۆریلاکە بوو بە هاوڕێی لێلی و جاک و چوونەوە بۆ ماڵەوەو تێر تێر مۆزی خوارد و بوون بە هاوڕێ.



# بەسەرهاتی هانسێڵ و گریتڵ

هەبوو نەبوو پیاوێکی داربڕی هەژار هەبوو، دوو منداڵی هەبوو ناویان هانسێڵ و گریتڵ بوو، دایکیان مرد کاتێک هەردووکیان منداڵ بوون، باوکیان ژنێکی تری هێنا بوو، خێزانە نوێیەکەی لەسەر هەژاری ڕانەهاتبوو، دوای چەندین ساڵ لە هەوڵ دان بۆ پەیداکردنی خواردن بۆیان ببوو و بە ژنێکی ڕەق و توندو تیژ، ئێوارەیەکیان لەو کاتەی کە دوو منداڵەکە لە برسا خەریک بوو خەویان لێ دەکەوت، گوێیان لە باوکیان و زڕ دایکیان بوو کاتێک کە مشت و مڕیان بوو، زڕدایکیان دەیووت: ئێمە ناتوانین خواردن بۆ خۆمان منداڵەکان پەیدا بکەین، ڕەنگە هەمومان لە برسا بمرین، بەیانی دەبێت ئەو دوو منداڵە ببەین بۆ دارستان و لەوێ بەجێ یان بهێڵین، باوکیان ناڕازی بوو بەڵام نەشیتوانی ژنەکەی لە دەست بدات بۆیە لە کۆتایدا ڕازی بوو، منداڵەکان کاتێک کە گوێیان لەو قسانەی زڕدایکیان بوو زۆر ترسان بەڵام هانسێڵ دڵنەوایی خوشکەکەی دەدایەوە و ووتی: نیگەران مەبەو ئەگەڕێم هەندێک



بەردی سپی دەدۆزمەوە ئەگەر بە درێژایی ڕێگاکە بە جێی بهێڵم ئەوا بە ئاسانی
ڕێگەی ماڵەوە دەدۆزینەوە، بۆ ڕۆژی دواتر هانسێڵ ئەوەی کرد کە پلانی بۆ دانابوو،
پیاوە دار بڕەکەو ژنەکەی مناڵەکانیان لە دارستانەکە بەجێ هێشت و بەڵێنی
ئەوەیان پێدان کە بگەڕێنەوە بۆ لایان و یەکسەر گەڕانەوە ماڵەوە، بەڵام هانسێڵ
و گریتڵ توانیان ڕێگەی ماڵەوە بدۆزنەوەبەهۆی ئەو بەردە سپیانەی کەلەسەرەتای
بەجێ هێشتنی کوخەکەیانەوە لەسەر ڕێگەیان بەجێیان هێشتبوو، کەگەڕانەوە ماڵەوە
باوکیان زۆر دڵخۆش بوو بە بینینی مناڵەکانی بەڵام هاوسەرەکەی زۆری پێ ناخۆش
بوو، دوای هەفتەیەک جارێکی تر ژنەکە تەنگی بە پیاوەکەی هەڵچنی و داوایکرد
مناڵەکان ماڵەکە بەجێ بهێڵن، بەڵام ئەمجارە دەرگای لەسەر منداڵەکان داخست،
بۆ ئەوەی ڕێگە لە هانسێڵ بگرێت تاکو بەردی سپی کۆبکاتەوە بەڵام هانسێڵ بە
گریتڵی خوشکی ووت: خەمت نەبێت ئەمجارە پارچە نانی وورد لەسەر ڕێگاکە بەجێ
دەهێڵین بەم ڕێگەیە دەتوانین ڕێگەی ماڵ بدۆزینەوە وەک ئەوەی بەبەردە سپیەکان



کردمان، جارێکی تر باوکیان و زڕ دایکیان منداڵەکانیان برد بۆ دارستانەکە و لەوێ بە جێ یان هێشتن بەڵام کاتێک هانسێڵ و گریتڵ هەڵیان دا لە ڕێگەی وورده نانەکەوە بگەڕێنەوە ماڵەوە بینیان کە باڵندەکان هەموو وورده نانەکانیان خواردووە، منداڵەکان سەرگردان مانەوە نەیان ئەزانی ڕوو بکەنە کوێ، لەناکاو گریتڵ ووتی: تەماشا بکە! بەدەستەکانی ئاماژەی بۆ ناو دارەکان دەکرد، لەوێ خانوویەکی بچووکی سەیر هەبوو کە سەقف و دیوارەکانی لە نانی زەنجەفیل دروست کرا بوو پەنجەرەکانیشی لە شەکر، منداڵە برسیەکان بەرەو لای خانووە کە ڕایان کرد، زۆر بەتامە، هانسێڵ هاواری دەکردو پڕ دەمی کردبوو لە خواردن بەڵام دەنگێک لەو لاوە هات و ووتی: ئەوە کێیە ماڵەکەم دەخوات؟ دوو مناڵەکە لە ترسان ڕاچەڵەکین، ژنێکی پیر لە ماڵەکە هاتە دەرەوە کە تەماشایان کرد بینیان ئەو سیحر بازە بوو کە حەزی لە خواردنی منداڵ بوو، لەسەرەتادا بە باشی خۆی نیشاندا و بە منداڵەکانی ووت: وەرنە ژوورەوە هەندێک نان و شۆرباتان دەدەمێ، کاتێک منداڵەکان نانەکەیان



خوارد پیرە ژنەکە منداڵەمانی خستە ناو جێگایەک تا بخەون، بەڵام بۆ ڕۆژی دواتر سیحر بازەکە هانسێلی لە شوێنێکدا داناو دەرگاکەی لەسەر داخست زۆری لە گریتڵ کرد تاکو شەوو ڕۆژ کاربکات کە خواردن بۆ هانسێڵ دروست بکات، سیحر بازە پیرەکە لەبەر خۆیەوە دەیووت: لەم نزیکانە تەواو قەڵەو دەبێت تاکو بیخۆم، هەموو ڕۆژێک سیحربازەکە داوای لە هانسێڵ دەکرد کە پەنجەی لە پەنجەرەکەوە بهێنێتە بۆ ئەوەی بزانێت کە قەڵەو بووە یان نا بەڵام هانسێڵ زۆر زیرەک بوو قاچی مریشکی لە جیاتی پەنجەی لە پەنجەرەکەوە دەردەکرد، سیحربازەکەش دەیووت: هێشتا زۆر لاوازیت، لە کۆتایدا ئەو ڕۆژەهات کە سیحربازەکە لەوە زیاتر چاوەڕێ نەکات، داوای لە گریتڵ کرد کە ئاگری ژێر فڕنەکە دابگیرسێنێت، دوای ماوەیەک پێی ووت: سەرت بکە بە ناویدا بزانە فڕنەکە تەواو گەرم بووە؟ بەڵام گریتڵ وا خۆی دەردەخست کە تێنەگەیشتووە دەترسا لەوەی کە سیحربازەکە پاڵێکی پێوە بنێت بۆ ناو فڕنەکە، بە تووڕەییەوە سیحربازەکە پاڵێکی بە گریتڵەوە ناو خۆی سەیرێکی ناو فڕنەکەی



کرد، لە چاو تروکانێکدا گریتڵ پاڵێکی بە سیحربازەکەوە ناو کردیە ناو فڕنەکەوەو دەرگای فڕنەکەی لەسەر داخست و ڕایکرد بۆلای براکەی تاکو ئازادی بکات، هانسێڵ و گریتڵ لە خۆشیدا پێدەکەنین کاتێک توانیان لە ماڵی سیحربازەکە ڕابکەن و ڕزگاریان بێت، بەڵام هێشتا ناتوانن بگەڕێنەوە ماڵەوە و ڕێگاکە پێ نازانن، دواتر باڵندەیەک بە ئاسماندا فڕی و لەبەرزییەوە بانگی کرد ووتی: من ووردەنانی سەر ڕێگاکەتانم خواردووە، من ڕێگەی ماڵەوەتان پێ نیشان دەدەم، هەر بۆیە هانسێڵ و گریتڵ دوای باڵندەکە کەوتن و لە کۆتایدا گەیشتنەوە کوخی پیاوە دار بڕەکەو باوکیان لە خۆشی بینینی مناڵەکانی فرمێسکی شادی دەڕشت، باوکیان پێی ووتن کە ژنەکەی گەڕاوەتەوە ماڵی باوکی و ناگەڕێتەوە هەموو ڕۆژێک من بە دوای ئێوەدا دەگەڕام منداڵەکانم، ئێمە جارێکی تر بە یەکتری شاد بووینەوە، هانسێڵ و گریتڵ وایان ووت و گیرفانەکانیان بە تاڵ دەکرد، ئێمە ئاڵتون و پارەی زیومان دۆزییەوە لە ماڵی سیحر بازەکە، هەرگیز جارێکی تر هەژار نابینەوە، هەربۆیە هانسێڵ و گریتڵ و باوکیان بۆ هەتا هەتایە بە خۆشی ژیان لە کوخە بچوکەکەیاندا.



# بەسەرهاتی شازادەو دەنکە پاقلەکە

هەبوو نەبوو میرێک هەبوو کە دەیویست هاوسەرگیری بکات، میرەکە زۆر ئازاو میهرەبان و جوان بوو، زۆر کچ هەبوون کە ئاواتە خواز بوون شووی پێ بکەن بەڵام تەنها یەک کێشە هەبوو ئەویش ئەوە بوو کە میرەکە جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە دەبێ هاوسەرگیری لەگەڵ شازادەیەک بکات، هەر کاتێک کە سەردانی وڵاتێکی تری دەکرد میرەکە هەموو ئەو شازادانەی دەبینی کەلەوێدا دەژیان بەڵام هەمیشە بەبێ بووک دەگەڕایەوە، شەوێک کە ڕەشەبا بوو میرەکە لەگەڵ پاشا و پاشا ژندا لە کۆشک بوون باران دەستی پێکرد و بایەکی بەهێز هەڵی کردبوو کە لورەی دەهات، لەناکاو لەگەڵ گرمەی هەورەکاندا یەکێک لە دەرگای کۆشکەکەی دا، زۆر سەیر بوو لە شەوێکی ئاوادا کەسێک لە دەرەوە بێت، پاشا خۆی چوو دەرگای کردەوە تا بزانێ کێیە، لەبەر دەرگاکە کچێکی جوان و ڕووخۆش وەستا بوو، تەڕ ببوو لەسەرمادا دەلەرزی و ووتی: من شازادەم، تکایە نەتوانم بێمە ژوورەوە تاکو گەردەلولەکە کۆتایی



دێت؟ هەر زوو میرەکە چاوی چووە سەر کچەکە، یەکسەر خۆشەویستی لە دڵی دا دروست بوو بەرامبەری و بڕیاری دا بیکات بە هاوسەری خۆی و بە دایکی ووت: دواجار ئەو شازادەیە، دواتر کاتی خەو شاژن فەرمانی دا کە جێگایەکی نوستن بۆ شازادەی میوانیان ئامادە بکەن، کاتێک ژوورەکە پیشانی شازادە درا، سەرسام بوو کە بینی جێی نوستنەکەی بیست دۆشەکی پەڕ لەسەر یەک دانرا بوون، بەڵام هیچی نەوت و بەسەر دۆشەکەکاندا سەرکەوت، پاشا پرسیاری لە پاشا ژن کرد و ووتی: ڕات چیە سەبارەت بە میوانە گەنجەکەمان؟ ئایا بەڕاستی ئەو شازادەیە؟ شاژن ووتی: بەم زووانە بۆمان دەردەکەوێت، من لە ژێر بیست دۆشەکی پەڕدا دەنکە پاقلەیەکی ووشکراوەم داناوە، بۆ بەیانی ڕۆژی دواتر خێزانی شاهانە نانی بەیانیان دەخوارد کاتێک کە میوانەکەیان دەرکەوت، پاشا پرسیاری لێکرد، بەباشی خەوتی؟ ئازیزم؟ شازادە ووتی: زۆرباش نا، نازانم چی بوو بەڵام شتێک لە ژێر دۆشەکەکانەوە بێزاری دەکردم و بە درێژایی شەو بە ئاگای دەهێنامەوە، شاژن ووتی: کەواتە تۆ شازادەی ڕاستەقینەیت، تەنها شازادەی ڕاستەقینە پێستی نەرمی هەیە و هەستی پێ دەکات، خۆش بەختانە شازادە میری خۆش ویست و زۆری پێنەچوو هاوسەرگیریان کردوو بە ئاسوودەییەوە ژیانیان بردە سەر لەو کاتەوە.



# بەسەرهاتی سەمبلینا (کچە وردیلە)

هەبوو نەبوو ژنێک هەبوو زۆر دەمێک بوو دەیویست کچێکی خۆی هەبێت، هەر بۆ ئەو مەبەستە چوو بۆ لای ژنێکی ژیر و داوای یارمەتی لێکرد، ژنە ژیرەکەش پێی ووت: ئەم تۆوە پیاوە لە ئینجانەیەکدا بچێنە و دەبینی ئاواتەکەت دێتە دی، ژنەکەش ئەوەی کرد کە ژنە ژیرەکە پێی ووتبوو، تۆوەکەی خستە ئینجانەیەکەوە و ئاوی دا دوای ماوەیەک دوو گەڵا لە خۆڵەکەوە سەریان دەرهێنا،لە چەند ڕۆژێکی کەمدا خونچەی گوڵە... بە دیار کەوتو خونچەکە پشکەوت و گوڵێکی زەردی جوان دروست بوو وە لە ناوەڕاستی گوڵەکەدا کچێکی بچووکی تێدا بوو، کچەکە هێندەی پەنجە گەورەی ژنەکە گەورە بوو، ژنەکە لە خۆشیدا هاواری کرد و ووتی: ناوی دەنێم سەمبلینا، سەمبلینای بچووک زۆر بە ووردی چاودێری دەکرا، دایکی جل و بەرگی



زۆر بچووکی بۆ درووو و شوێنی نوستنی لە ناو کاکڵە گوێزێکدا بۆ دروست کرد، بەڵام ڕۆژێکیان لەو کاتەی سەمبلینا لەسەر مێزەکە دانیشتبوو گۆرانی بۆ خۆی دەووت، دایکە بۆقێکی بەتەمەن لە پەنجەرەکەوە بازیداو سەمبلینای لەگەڵ خۆیدا برد، بۆقەکە ووتی: تۆ زۆر جوانی دەبێت شوو بە کوڕەکەم بکەیت، سەمبلینای لەسەر گەڵای گەڵە شێرێک لە ناوەڕاستی ڕووبارەکە بە جێ هێشت و سەمبلینا دەستی کرد بە گریان، نەیدەویست شوو بە بۆقێکی پیس بکات لە ناو قوڕدا بژێت، هەندێک ماسی بچوک کە لە ناو ڕووبارەکەدا مەلەیان دەکرد بەلای سەمبلینا تێپەڕین و فرمێسکەکانیان بینی بڕیاریان دا یارمەتی بدەن هەر بۆیە قەدی گەڵای گوڵە شێرەکەیان قرتاند و ئەو کەڵایەی کە سەمبلینای لەسەر بوو بە ڕووبارەکەدا ڕۆشتە خوارەوە، سەمبلینا زۆر خۆش حاڵ بوو کە لە دەست بۆقەکان ڕزگاری بوو لە ڕۆخی ڕووبارەکە گوێی لێ بوو و چەند پەپولەیەکی جوان بەسەر سەریەوە دەسوڕانەوەبەڵام کێشیەکانی کچە بچووکەکە کۆتایی نەهاتبوو، قالۆنچەیەکی ڕەش نیشتەوەو سەمبلینا ی لەگەڵ خۆی هەڵگرت و بردی بۆ سەر دارێکی زۆر بەرز کە خێزانەکەی لەوێدا دەژیان، لەسەر دارەکە یەکێک لە قالۆنچەکان ووتی: ئەمە چیە؟ دوو قاچی هەیە چەند ناشرینە، هەر بۆیە قالۆنچەکان بە دڵیان نەبوو و ڕێگەیان دا بڕوات، بە درێژایی وەرزی



هاوین سەمبلینا جارێکی تر دڵ خۆش بوو هاوڕێیەکی پەیدا کرد و لەگەڵ باڵندەو پەپوولە گێلاس و تووێیان دەخوارد لە شەودا لە هێلانەی بە تاڵی باڵندە کان دەژیا. بەڵام کە هاوین بەرەو کۆتایی چوو هاوڕێکانی ون بوون و خواردن قاتی بوو زۆر ساردبوو کە نەیدەتوانی لە شەودا بخەوێت، ڕۆژێک لە برسان دەلەرزی، سەمبلینا مشکێکی بینی کە لە ماڵەکەیەوە هاتە دەرێ و مشکەکە بە سەمبلینای وت: تۆ دەتوانیت بۆ ماوەیەکی کەم لەگەڵ مندا بمێنیتەوە، سەمبلینا ماڵەکەی زۆر بە دڵ بوو بەڵام زۆر بچووک بوو، مشکەکە پێی ووت: پێویستە تۆ مشکە کوێرەی هاوڕم ببینی، ئەو بە دوای ژندا دەگەڕێت و خانوویەکی گەورەی هەیە لە ژێر زەویدا، هەر بۆیە سەمبلینا ڕۆشت و تاکو ماڵی مشکە کوێرەی بینی، ماڵێکی تاریک و سارد بوو مشکە کوێرەکە بەڕێڕەوێکی تەسکدا بردی و پێی وت: لێرە ووریا بە شتێک لە ناو کونەکەمدا مردووە، سەمبلینا چەمایەوەو هەستی بە جەستەی باڵندەیەک کرد، جەستەی باڵندەکە زۆر سارد بوو بەڵام دڵی هێشتا لێی دەدا، سەمبلینا چرپاندی بە گوێی باڵندەکەدا و و پێی ووت: من چاودێریت دەکەم و وا دەکەم باش ببیتەوە، باڵندەکە پەرەسێلکە بوو، سەمبلینا خواردنی بۆ پەرەسێلکەکە هێناو بە گەڵا داییۆشی تاکو گەرم بێتەوە، زۆری پێنەچوو پەرەسێلکەکە توانی چاک بێتەوەو توانی بفڕێت،



سەمبلینا ماڵئاوایی لێکرد و تەماشای کرد تاکو لەبەر چاوی وون بوو، ئەو کاتەی کە خۆری بەهار زەوی گەرم کرد سەمبلینا بە خەمباریەوە دانیشتبوو تەماشای ئاسمانی شینی دەکرد، تۆقی بوو لە ژیان لە ژێر زەویدا چونکە هیچ کات تیشکی خۆر و گوڵی جوانی بەهاری نەدەبینی، لە ناکاو باڵندەیەکی زۆری لە بەرزاییەوە بینی وتەماشای کرد ئەو پەرەسێلکەیە بوو کە ڕزگاری کرد بوو، پەرەسێلکەکە کە سەمبلینای بینی نیشتەوەو پێی ووت: لەسەر پشتم سەربکەوە، دەتبەم بۆ شوێنێک کە هەمیشە گەرم بێت و گوڵەکانی هەرگیز لێ نەمرن، سەمبلینا خۆی بە پەڕەکانی پەڕە سێلکەکەوە گرت و بەسەر زەوی و ئاودا فڕی، لە کۆتایدا پەرەسێلکەکە لە مێرگێک نیشتەوەو کە پڕ بوو لە گوڵ، لەوکاتەی کە سەمبلینا تەماشای دەوروبەری خۆی دەکرد، سەرسام بوو بەوەی کە لە ناو گوڵەکاندا کەسێک تیای دانیشتبوو هەروەکو خۆی بچووک. پیاوێکی بچووک هات بەرەو ڕووی و زەردەخەنەی بۆ کرد و پێی ووت: من پاشای کوڵە مرۆڤەکانم بەخێر بێیت بۆ خاکەکەمان ئێمە تۆ بە مایا بانگ دەکەین، سەمبلینا زۆر دڵخۆش بوو کە زۆر هاوڕێی دۆزییەوە، گەورە بوو کەوتە داوی خۆشەویستی ئەو پاشایەی کە بۆ یەکەم جار پێشوازی لێکرد و زۆر بە خۆشحاڵیەوە لە نێوان ئەو خەڵکانەدا ژیا بوو بە شاژنیان.




# بەسەرهاتی جاک و قەدی فاسۆلیاکە

ڕۆژێکیان دایکی جاک بە جاکی ووت: پێویستە ئێمە مانگەکەمان بفرۆشین، هیچ پارەیەکمان بە دەستەوە نەماوە، وە تۆش هێندە کوڕێکی تەمەڵ و گەمژەیت کە هیچ کات ناگەڕێی تاکو کارێک بدۆزیتەوە و هەندێک پارە پەیدا بکەیت، هەر بۆیە جاک مانگاکەی لەگەڵ خۆیدا برد بۆ بازاڕ، لەڕێگا کەسێکی نەناسراوی بینی و پێی ووت: بۆچی ئەم هەموو ڕێگایە دەبڕیت بەرەو بازاڕ؟ من ئەو مانگایە لە تۆ وەردەگرم و لە بەرامبەردا ئەم فاسۆلیا سیحراویەت پێ دەدەم، بڕوام وایە کە ڕازی ببیت، جاک زۆر دڵخۆش بوو بە هەبوونی فاسۆلیایەکی سیحراوی و مانگاکەی دایە دەستی کابرا نەناسراوەکە، بەڵام کاتێک کە گەڕایەوە دایکی زۆر تووڕە بوو و بە جاکی ووت: تۆ زۆر گێلیت، دەی خێرا بڕۆ بنوو نابێت نانی ئێوارەش بخۆیت، دایکی وای ووت و دەنکە فاسۆلیاکانی لە پەنجەرەکەوە فڕێدایە خوارەوە، بۆ بەیانی ڕۆژی دواتر کاتێک جاک لە خەو هەستا، بینی کە ژوورەکە زۆر تاریکە، لە پەنجەرەکەوە تەماشایەکی کرد و سەری سوڕما کەبینی درەختێکی زۆر گەورەی فاسۆلیا لە تەنیشت خانووەکەیانەوە ڕوواوە، دارەکە هێندە گەورە





بوو کە لووتکەکەی لەناو هەورەکاندا بوو، هەرچەندە کە جاک کوڕێکی تەمەڵ بوو بەڵام لە هەمان کاتیشدا ئازا بوو، لە پەنجەرەکەوە چووە دەرەوە و بەسەر قەدی داری فاسۆلیاکەدا هەڵگەڕاو سەرکەوت و سەرکەوت تا گەیشتە کۆتایی دارەکە کە، کەوتبووە سەرو هەورەکانەوە، زۆر لە دوور قەڵایەکی گەورەی بینی، بەرەو قەڵاکە کەوتە ڕێ لەو کاتەی کە شەو داهات گەیشتە بەر دەرگای قەڵاکەو لە دەرگاکەیدا، ژنێک هات و دەرگاکەی کردەوە و بە سەرسامیەکەوە تەماشایەکی جاکی کردوو ووتی: تۆ ناتوانیت لێرە بمێنیتەوە، پیاوەکەم زۆر دڕندەیە، منداڵی بچووک دەخوات، بەڵام جاک بۆ ژنەکەی ڕوون کردەوە کە برسیەتی و ماندووە، ئیتر ژنەکەش بەزەیی پێدا هاتەوە و ڕێگای دا بچێتە ژوورەوە، هەرکە جاک دەستی کرد بە خواردن هەستی بەوەکرد کە زەویەکە دەلەرێتەوە ژنەکە هاواری کرد: ئەوە پیاوەکەی منە گەڕایەوە، خێرا خۆت لە فڕنەکەدا بشارەوە، جاک خێرا خۆی شاردەوە و پیاوە دڕندەکەش هاتە ژوورەوە و بە دەنگە زلەکەی ووتی: فی، فای، فوو، فەم، بۆنی کەسێکی منداڵێک دەکەم، زیندوو بێت یان مردوو، ئێسک و پروسکی دەهاڕم و دەیکەم بە نان، ژنەکەی لەو لاوە ووتی: قسەی بێ مانا، ئەوە بۆنی ئەو شۆربایەیە کە ئامادەم کردووە بۆ نانی ئێوارە، پیاوە دڕندەکە دانیشت و سوپەکەی خوارد کاتێک کە تەواو بوو، بانگی ژنەکەی کرد و پێی ووت: مریشکەکەم بۆ بهێنە، ژنەکەشی چووە دەرەوەو مریشکێکی سپی بۆ هێنا، پیاوە دڕندەکە





مریشکەکەی هێناو بەسەری دا هاواری کرد و ووتی:بیکە، مریشکەکە هێلکەیەکی ئاڵتوونی ککرد، جارێکی ترو جارێکی تر فەرمانی بە مریشکەکە کرد کە هێلکەی ئاڵتوونی زیاتر بکات تاکو دوانزە هێلکەی ئاڵتوونی لەسەر مێزەکە کرد، دواتر پیاوە درندەکە خەوی لێ کەوت و پرخەی دەهات، کاتێک جاک گوێی لە پیاوە کە بوو پرخەی دەهات دەرگای فرنەکەی کردەوەو بازیدا و مریشکە سیحراویەکەی هەڵگرت و هەتا هێزی تێدا بوو ڕایکرد تا گەیشتە خوارەوە، هەناسەی لێبڕا و لەبەرامبەر دایکیدا وەستا، دایکی پێی ووت: بۆچی جاک، ئەوە ئەو مریشکە پیاوە درندەکە لە باوکە هەژارەکەی دزیوە، ناخۆشیەکانیان بەسەرچوو و تێپەڕی، هەرچەندە جاک و دایکی زۆر دەوڵەمەند بوون، بەڵام کوڕەکەی هێشتا حەزی لەسەر کێشی بوو، ڕۆژێکیان جارێکی تر بەسەر قەدی دار فاسۆلیاکەدا سەرکەوت و بەرەو قەڵای پیاوە درندەکە بەڕێ کەوت، جارێکی تر خۆی شاردەوەو گوێی لە دەنگی پیاوە درندەکە بوو: فی، فای، فوو، فەم، بۆنی خوێنی منداڵێک دەکەم، زیندوو بێت یان مردوو، ئێسک و پروسکی دەهاڕم و دەیکەم بە نان، ژنەکە نانی ئێوارەی بۆ هێناو جاک سەلامەت بوو، دوای تەواو بوونی لە نان خواردن، پیاوە درندەکە بەژنەکەی ووت کە ئەو جانتا پارەیە بهێنێت، لەو کاتەدا جاک تەماشای دەکرد چەند جانتایەکی پڕ لە ئاڵتوونی هێناو لە بەر خۆیەوە دەیووت: هەر کە خەوی لێکەوت من ئەو جانتا پارانە دەبەم، بەهەمان شێوەی جاری یەکەم پیاوەکە خەوی





لێکەوت و جاکیش جانتا پارەکانی فڕاند، دایکی زۆر دڵ خۆش بوو بە جاکی ووت: ئەم پارانە هی باوکت بوو، دوای تێپەڕبوونی ماوەیەک جاک بڕیاری دا جارێکی تر بەسەر قەدی دارەفاسۆلیاکەدا سەربکەوێتەوە، هەموو شتەکان وەک جاری پێشوو ڕوویاندا، دوای خواردنی نانی ئێوارە پیاوە دڕندەکە بانگی ژنەکەی کرد و پێی ووت: ئەو قیسارەیەم بۆ بهێنە، ژنەکەش قیسارەکەی بۆ بهێنە و لەسەر مێزەکە داینا، پیاوە دڕندەکە فەرمانی بە قیسارەکە کرد کە ئاوازێک بژەنێ، یەکسەر قیسارەکە خۆشترین میوزیکی ژەند کە تا ئەو کاتە جاک نەیبیستبوو، زۆری پێ نەچوو پیاوە دڕندەکە خەوی لێکەوت و جاک قیسارەکەی گرت و لە دەرگاکەوە ڕایکردە دەرەوە بەڵام قیسارەکە هاواری کرد: گەورەم، گەورەم، پیاوەکە لە خەو هەستاو ڕاوی جاکی نا، دەنگی قاچەکانی دەتووت هەورە بروسکەیە، جاک تا لە هێزی دا بوو ڕایکرد بەرەو خوارەوە، هەرکە نزیک بووەوە لە زەوی هاواری کرد: دایکە، دایکە تەورەکە بهێنە، دایکی تەورەکەی هێناو جاک تا هێزی تێدا بوو یەک تەوری کێشا بەقەدی دار فاسۆلیاکەدا و قەدەکەی قرتاند و پیاوە دڕندەکە کەوتە خوارەوەو مرد، لەو ڕۆژە بە دواوە جاک و دایکی بە خۆشی و کامەرانی ژیانیان بردە سەر.



# چیرۆکی پینۆکیۆ

جپیتۆ دارتاش بوو یاری منداڵانەی بۆ منداڵانی گوندەکەیان دروست دەکرد، رۆژێکیان بووکەشوشەیەکی درووست کرد هەر لە دروستکردنی تەواو بوو، بووکە شوشەکە ژیانی بەبەردا هات و کەوتە گۆرانی ووتن و سەما کردن! جپیتۆ ووتی: بۆ تۆ زیندووی؟! بۆیە جپیتۆ بە دوای ناوێکدا گەڕا تا پێی بانگ بکات بۆیە ناوی نا پینۆکیۆ پێی ووت: بە پینۆکیۆ بانگت دەکەم و دەتکەم بە کوڕی خۆم!، رۆژی دواتر جپیتۆ بە پنۆکیۆی ووت: پێویستە بچیت بۆ خوێندنگا بەڵام پینۆکیۆ زۆر بەبێ شەرمانە.وەڵامی دایەوە و ووتی: من ناچم، من نامەوێت بچم بۆ خوێندنگا، بۆیە پینۆکیۆ زۆر لێی تورە بوو زلەیەکی کێشا بە گوێیەکانیدا، لەو کاتەدا پۆلیسێک بەوێدا تێپەڕی و بینی جپیتۆ لە پینۆکیۆیدا، وای هەست کرد کە زۆر ئازاری داوە بۆیە جپیتۆی لەگەڵ خۆیدا برد و شەوێک زیندانی کرد،



کاتێک جیپتۆ گەڕایەوە بۆ ماڵ وەستا تا سەیری نمایشی سەمای پینۆکیۆ بکات کە زۆر بە جوانی سەمای دەکرد، ڕاهێنەری پینۆکیۆ پێنج پارەی ئاڵتونی دایە پینۆکیۆ و پێی ووت: کە بیبات بۆ باوکی، دواتر پینۆکیۆ پشیلەیەکی فێڵبازو ڕێویەکی شەرمنی بینی پێیان ووت ئەگەر ئەو پارانە لە ژێر دارێکدا بنێژێت ئەوا ژمارەی زیاد دەبێت و پارەیەکی زیاترت دەست دەکەوێت، پینۆکیۆش بڕوای پێکردن بۆیە پارەکانی لە ژێر دارێکدا ناشت و هەر لەژێر دارەکەدا خەووت، پشیلە و ڕێویەکە پینۆکێۆ یان بە دارەکەوە بەستەوە و پارەکەیان برد و هەلهاتن، پەرییەکی ئەفسانەیی دڵسۆز کە جلێکی شینی لەبەردا بوو پینۆکیۆی ئازاد کردوو، لە پاداشتی ئەو چاکەیەی کە پەریەکە لەگەڵیدا کردی پینۆ کیۆ دەستی کرد بە گێڕانەوەی چیرۆک بۆی، دواتر شتێکی سەیر روویدا لووتی پینۆکیۆ تا دەهات درێژ و درێژتر دەبوو، زۆر خەمبار بوو بە پەریەکەی وت: تکایە لوت درێژبونەکەم بوەستێنە، پەریە شینەکە بە پینۆکیۆ وت: لوت درێژ بونەکەت ناوەستێت، هەرکاتێک



درۆبکەیت لوتت درێژ دەبیت، پینۆکیۆ ووتی: تکایە بیوەستێنە بەڵێن ئەدەم کە هەرگیز جارێکی تر درۆ نەکەم، بۆ رۆژی دواتر لە رێگای چوون بۆ قوتابخانەیدا پینۆکیۆ کورێکی بینی، کورەکە پێی ووت: وەرە لەگەڵم بۆ شاری خۆشی لەوێ هەموو رۆژێک پشووە، یاری منداڵان و شیرینی زۆری لێیە لە هەمووی خۆشتر ئەوەیە کە لەوێ هیچ وانەیەک نیە بیخوێنی یان فێری ببیت، بۆیە پینۆکیۆ بە خێرایی و بەخۆشیەکی زۆرەوە لەگەڵ کورەکەدا رۆشت بۆ شاری خۆشی کە یاری و خواردنی خۆشی زۆر لێیە، لەوێ کورەکانی تری بینی کە گوێیان درێژ بوو وەکو گوێدرێژیان لێدەهات، لەو کاتەی کە بەناو شاری خۆشیدا پیاسەی دەکرد راهێنەری سێرکەکە داوای لە پینۆکیۆ کرد کە لە سێرکەکەدا بەشداری بکات بەڵام پینۆکیۆ لە کاتی ئەنجامدانی فێڵەکاندا قاچەکانی ئازاری پێگەیشت بۆیە راهێنەرەکە لێی تورە بوو و پینۆکیۆی هەڵدا ناو دەریاکەوە، لە ناو دەریاکە پینۆکیۆ جارێکی تر بووەوە بە بووکە شوشە، لە ئاوەکەدا نەهەنگێکی مەلەوانی دەمە گەورەکەی کردەوەو پینۆکیۆی قووت دا، لە ناو سکی نەهەنگەکەدا پینۆکیۆ جیپتۆی بینی لە بەلەمەکەیدا بوو، جیپیتۆ بە



پینۆکیۆی ووت: من بە دواتدا دەگەرام کاتێک نەهەنگەکە منی قووت دا بۆیە زۆر خۆشحاڵم بە بینین، هەردوکیان باوەشێکی توندیان کرد بە یەکدا، پینۆکیۆو وتی: من دەبم بە کورێکی زۆر باش و گوێڕایەڵ، پینۆکیۆ بەڵێنی بە جیپیتۆ دا، بۆیە کاتێک نەهەنگەکە خەوی لێکەوت هەردوکیان لە دەمی نەهەنکە هەڵهاتن و گەڕانەوە بۆ ماڵ، کە گەیشتنەوە ماڵ جیپیتۆ هەستی بە نەخۆشی کرد بۆیە پینۆکیۆ شۆربایی گەرمی بۆ ئامادە کرد و بە وردی چاودێری جیپیتۆی دەکرد و بە جیپیتۆی ووت: من دەچم بۆ خوێندنگا و کاردەکەم بۆ ئەوەی پارەیەکی زۆر پەیدا بکەم، هەرگیز ناهێڵم جارێکی تر تۆ کاربکەیت، لەوە بەدواوە پینۆکیۆ وانەکانی زۆربەباشی دەخوێند و هەوڵی زۆر دەدا تا سەرکەوتن بەدەست بهێنێت، رۆژێکیا پەریە ئەفسانەییە شینەکە دەرکەوتەوە بە پینۆکیۆی ووت: تۆ زۆر ئازایت زۆر میهرەبانیت مافی خۆتە ببیت بە کورێکی ڕاستەقینە، بۆیە پەرییە شینەکە پینۆکیۆی کرد بە کورێکی ڕاستەقینە. جیپیتۆ و پینۆکیۆ پێکەوە ژیانێکی زۆر ئاسودەیان دەبردە سەر و زۆر خۆشحاڵ بوون.

# چیرۆکەکانی منداڵی زیرەك



07701918565 - 07501571818

چاپ و بڵاوکردنەوە

## ١٥ چیرۆکی بەناوبانگ


**ناوی کتێب:** چیرۆکەکانی منداڵی زیرەك

**وەرگێڕانی:** مامۆستا دیار ئەسعەد

**نۆبەتی چاپ:** چاپی سێهەم

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گتییەکان ژمارەی سپاردنی (١١٦٧) پێدراوە - مافی لە چاپدانەوەی پارێزراوە